# ((هونەری جەنگ))

کۆنترین کتێبی زانستی سوپایی لە جیهاندا




## نووسەر: سۆن تزوو (Sun Tzu)

## وەرگێڕان لە سەر زمانی چینییەوە بۆ زمانی ئینگلیزی: ساموئێل گریفیس



- جەنەڕاڵی سەرتیپ ساموئێل گریفیس (١٩٠٦-١٩٨٣) لە سوپای مارینزی ئەمریکا خزمەتی کردووە و لە کاتی جەنگی جیهانی دووەمدا چاودێری ڕاهێنانی هێزی کۆماندۆی بەریتانی بووە.
- پاش خانەنشینی دکتۆرای لە زانکۆی ئۆکسفۆرد لە سەر مێژووی سوپایی چین وەرگرتووە.
- خەڵاتی "خاچی هێزی دەریایی"، "خاچی خزمەتی دیار" و هەروەها "دڵی وەنەوشەیی"کە خەڵاتێکی تایبەتە بە بریندار بووەکانی جەنگی پێ بەخشراوە.
- کتێبی "لەبارەی جەنگی پارتیزانی" مائۆ تسی تونگ و "هونەری جەنگ" سۆن تزوو وەرگێڕاوەتەوە سەر زمانی ئینگلیزی.

## وەرگێڕان لە سەر زمانی ئینگلیزییەوە بۆ زمانی کوردی: هاشم محەممەد ئەحمەد کەرەمی



- هاشم کەرەمی (١٩٨٤) ماستەری هەیە لە زانستە ڕامیارییەکان لقی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکووری ئەفریقا. لە سەر دۆزی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیۆپۆلەتیکی کوردستان کار دەکات.
- لە ساڵی ٢٠١٢ ز. وەک مامۆستایە لە زانکۆی گەرمیان.
- چەند کتێبی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و فارسی.

# پێڕست

پێشکەشە بە:

# "پێشمەرگە و جەنگاوەرەکانی کوردستان"

**پێشەکی وەرگێڕ:**

بنەمای بیرکردنەوەی هەر نەتەوەیەک لە چوارچێوەی زمانەکەیدا دەردەکەوێت. لە زمانی کوردیدا وشەی "شەڕ" هاوتای نەهامەتی و خراپییە، بەڵام لە لایەکی دیکەوە مانای پێکدادان و بەرگری دوژمنیش دەگرێتەوە، واتا ئاشتی خوازی ئەم نەتەوەیە لە چوارچێوەی زمانەکەیدا دەرکەوتووە. بەڵام نابێت ئاشتی خوازی ببێتە هۆی ئەوەی بەرگری دوژمن و پاراستنی نیشتمان و ئازادی کە کارێکی پیرۆزە، وەکو نەهامەتی سەیر بکرێت. هەر پێکدادانێک خراپ نیە، بۆیە باشترە وشەیەکی دیکە بەکار بێت. وشەی جەنگ (War) باشتر مانای پێکدادان و بەرگری دوژمن دەگەیەنێت و باشترە ئەم وشەیە بەکار بێت. وشەی "جەنگ" بە پێچەوانەی وشەی "شەڕ" بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ مانای نەهامەتی و خراپی تێدا نیە لە بەر ئەوەی لەوانەیە جەنگ بۆ بەرگری دوژمن و پاراستنی شەرەف و نیشتمان و ئازادی بێت. بۆیە چەمکی جەنگ باشترە لە چەمکی شەڕ! جیا لە باسی زمانی کوردیش، هەر کەسێک ئەم کتێبە بخوێنێتەوە دەزانێت مەبەستی "سۆن تزوو" لە فێرکردنی هونەری جەنگ، بەرگری لە وڵات و خولقاندنی ئاشتی بووەو بۆیە زۆر لە خوێنەران ناوی "هونەری ئاشتی"یان لەم کتێبە ناوە کەواتە بەکارهێنانی چەمکی هونەری جەنگ شیاوترە.

سۆن تزوو فەرماندەیەکی چینی بووە نزیکەی ٢٥٠٠ ساڵ پێش ئێستا ژیاوە. بیرۆکەکانی ئەو، بنەمای بیرۆکەی سوپایی بووە لە جەنگی جیهانی یەکەم و دووەمدا. ئەم کتێبە ماوەیەکی زۆر لە سوپای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا وەکو بابەتێکی سەرەکی سوپایی گوتراوەتەوە. ئەم کتێبە پڕفرۆشترین کتێبی نووسەرێکی چینی بووە لە جیهاندا و زۆربەی سیاسەتمەدار و فەرماندە و بەڕێوەبەرە بەناوبانگەکانی جیهان وەکو "ناپلیۆن بوناپارت"، "هێنری کیسینجەر"، "بیل گەیتس" و "مائۆ تسە تونگ" خوێندویانەتەوە و پێشنیاری خوێندنیان کردووە.

سۆن تزوو خۆی لەو فەرماندانە بووە توانیویەتی هەموو زانیارییەکانی لە سەر هونەری جەنگ بکردەوە پیشان بدات و لە جەنگەکانیدا سەرکەوتن تۆمار بکات. ئەو توانیویەتی بە بەکارهێنانی ئەو هونەرانەی لەم کتێبەدا باسی کردووە بە سوپایەکی ٣٠ هەزار کەسی زاڵ بێت بە سەر سوپایەکی ٣٠٠ هەزار کەسی دوژمنەکەیدا.

مێژوونووسەکانی چین گێڕاویانەتەوە سۆن تزوو بە ئیمپراتۆر "هولوو" دەڵێت: من ئەتوانم سوپایەکی بچووک پێک بێنم کە بتوانێت سوپایەکی گەورە شکست بدات و ئەتوانم هەر کەسێک بکەمە جەنگاوەر! ئیمپراتۆر هولوو دەڵێت: تۆ تەنانەت ئەتوانیت ئەم ژنە نەرم و نیانانەی دەربارەکە هیچ لە جەنگ و شمشێر نازانن بکەیتە جەنگاوەر؟! سۆن تزوو دەڵێت: بە دڵنیاییەوە ئەتوانم!! ئیمپراتۆر لە وەڵامدا مەرجی فەرماندەیی سوپاکەی خۆی بۆ سۆن تزوو ئەوە دادەنێت کە بتوانێت سی ژنی دەرباری بکاتە جەنگاوەری لێهاتوو و پێی دەڵێت کەواتە من سی ژنی نەرم و نیانی ناو دەربارەکەم ڕادەسپێرم پێت با بزانم چۆن ئەتوانیت بیانکەیتە جەنگاوەر؟!

سۆن تزوو لە یەکەم ڕۆژدا پلە و پایە و ڕۆڵی سی ژنەکە دیاری دەکات و دوانیان دەکاتە فەرماندەی ئەوانی دیکە. پاشان فێریان دەکات چۆن بە دەنگی تەپڵ فەرمان وەربگرن و جێ بە جێی بکەن. پاش دەستپێکردنی تەپڵکوتان ژنەکان پێدەکەنن و بە قسەی ناکەن. سۆن تزوو دەڵێت: ئەگەر فەرمانی فەرماندە ڕوون و ئاشکرا نەبێت، هەڵەی فەرماندەیە، بەڵام ئەگەر وا نەبوو هەڵەی سەربازە و پاشان بە شمشێرەکەی هەردوو ژنە فەرماندەکە دەکوژێت! پاش ئەم ڕووداوە ئەو بیست و هەشت ژنەکە دەمێننەوە بە باشی گوێ لە فەرمانەکانی دەگرن و دواجاریش دەبنە بیست و هەشت جەنگاوەری لێهاتووی سوپای دڵهاتووی وڵاتەکەیان بە فەرماندەیی سۆن تزوو.

شایانی ئاماژەیە دوو نوسخەی ئینگلیزی هونەری جەنگ لە بەردەستمدا هەبوو بەڵام پاش بەراوردیان ئەو نوسخە ئینگلیزییەی کە سامویێل گریفیس لە زمانی چینییەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی ئینگلیزی و زانکۆی ئۆکسفۆرد لە چاپی داوە، بنەمای وەرگێڕانەکەی منە. لە نوسخەی وەرگێڕدراوی فارسییەکەیش یارمەتیم وەرگرتووە بۆ پوختکردن و کورتکردنەوەی خاڵەکان. لە بەر ئەوەی کتێبەکە زۆر ناو و چەمکی سەخت و نەپۆڕی چینی تێدا بوو و وەرگرتنی بیرۆکەی سۆن تزووی بۆ خوێنەر سەخت ئەکردەوە بڕیارمدا لە سەر بیرۆکەی کتێبەکە چڕ ببمەوە و ئەو ناو و چەمکە سەختانەش لابدەم. پاش وەرگرتنی بیرۆکەکەی سۆن تزوو، خوێنەر زۆر بە ئاسانی دەتوانێت چەمکەکانی ئەو سەردەمە و ئەم سەردەمە لە ناو خەیاڵی خۆیدا جۆرێت گالیکە بکاتە هامەر یا خود تانک، تیر کەوان بکاتە هاوەن، شمشێر بکاتە کلاشینکۆف و هتد!

بیرۆکەی وەرگێڕانی ئەم کتێبە لە خوێندنەوەی چۆنییەتی ستراتیجی سوپای داعش بە تایبەت چۆنییەتی هێرش کردنیانەوە دێت. خوێندنەوەکان دەریخستووە فەرماندەکانی ئەوان بە دڵنیاییەوە لە فێڵ و بنەما ستراتیجییەکانی کتێبی (هونەری جەنگ)کەڵک وەردەگرن. پاش شەوێکی تەم و مژاوی کە زۆر دڵنیگەرانی هێرشێکتوپڕی دوژمنان بووم و بە داخەوە لە بەیانیدا هەواڵی شەهیدبوونەکان گەیشت، منیش بۆ خزمەتی پێشمەرگە و جەنگاوەرەکان بە باشم زانی کارێکی زانستییان بۆ بکەم و وەرگێڕانی ئەم کتێبەم بە سوود زانی.

هەر فەرماندەیەکی پێشمەرگە، ئەفسەر و جەنگاوەر و هەر سیاسەتمەدارێکیش ئەیەوێت بڕیار لە سەر جەنگ بدات، ئەبێت ئەم کتێبە بخوێنێتەوە ئەویش نە یەک جار!

هاشم محەممەد ئەحمەد

ماستەری زانستە ڕامیارییەکان (لقی زانستی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکوری ئەفریقا)

کوردستان کەلار، زانکۆی گەرمیان کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەت، ٢٧١٦ی کوردی

* سۆن تزوو دەڵێت: ماڵ و نەمانی سەرکردە، ژیان و مەرگی مرۆڤ، ئاوەدانی و وێرانی وڵات، هەموو لە دەرئەنجامی جەنگ و ململانێیەکدا دیاری دەبن وەکچۆن ئاوها ڕووداوێک ئەوەندەیەکە دەبێت ڕابەرەکان پێش هەر جموجوڵێکی لەزالەز و عەجەلەیی، لە ناخی جەنگ تێبگەن و هەڵسەنگاندنی سەرەتایی بۆ بکەن. چونکە هەمیشە هەواڵێکی ناخۆش بە ناوی جەنگی پێبووەوە سەرکردە بێ عەقڵەکان جاروبار ئەم ئاگرە هەڵئەگیرسێنن و خۆیشیان تێیدا دەسوتێن.

* بۆیە پێش هەر شتێک دەبێت توانای دەستپێکردنی جەنگ بە لەبەرچاوگرتنی ئەم پێنج فاکتەری سەرەکییە هەڵسەنگێنرێت:

١) بڕوای خەڵک بە حکومەت
٢) تەڤیری ستراتیجیکی
٣) بەرنامەی پەیوەست بە جموجوڵی سوپایی (هەڵگواستنەوەگەیاندنی خۆراک و تفاق و ...)
٤) لێهاتوویی ڕابەری فەرماندەی سوپا
٥) پلان و هونەری جەنگ

هەڵگیرساندنی جەنگ، زۆر ئاسانترە لە خولقاندنی ئاشتی.

It is much easier to make war than to make peace.

* ئەم ڕێزبەندییە بنچینەییە، زۆر ڕوون و ئاشکرایە کاتێک سەربازەکان بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمنی پەلاماردەر کۆ دەبنەوە، لە سەرەتادا کۆمەڵەی ڕاوێژکاران، بەرژەوەندی فەرمانڕەواکان و بڕوای خەڵک بە ئەوان هەڵدەسەنگێنن. پاشان چاو لە بارودۆخی کەش و هەوا و تایبەتمەندییەکانی ئەو وەرزەی تێدان و بیر لە دژوارییەکانی ڕووپێوی و بەرزی و نزمییەکانی زەوی دەکەنەوە. پاش ئەوەی ئەمکارانەیان بە قووڵی لێکدایەوە، فەرماندەیەکی شیاو و لێهاتوو

هەڵدەبژێرن بۆ ئەوەی هێرشەکە بەرێ بخات تا پاش تێپەڕبوونی سەربازەکان لە سنور، بەرپرسی دانانی یاسا و ڕێسای پێویست بێت وهەر فەرمانێکی دیکەیشکە پێویست بوودەریبکات.

١ ) **بڕوای خەڵک بە حکومەت:** بریتییە لە هاودڵی و هاوسۆزی ڕابەر و خەڵک بۆ یەکتری. ئەم هاودڵییە دەبێت بە شێوەیەک بێت خەڵک لە زۆری ڕێز و حورمەت و بڕوا بە ڕابەرەکەیان و بێ لەبەرچاوگرتنی مەترسی مەرگ، تا دوا هەناسە لەڕکێف و خزمەتی ڕابەردا بمێننەوە.

*کاتێک ڕابەر لەگەڵ خەڵکەکەیدا بە دادپەروەری، چاکە و حەق و مروەت هەڵسوکەوت بکات و متمانەیان بۆ خۆی ڕاکێشێت، سوپاکەی لە ڕا و بڕیارەکاندا لەگەڵی دەبن و هەمووشیان خۆشحاڵن لە خزمەتی سەرکردەکەیان و تەنانەت سۆزیان بۆ سەرکەوتنی سەرکردە زاڵدەبێت بەسەر ترسیان لە مردندا.

٢ ) **تەقیبی ستراتیجی:** بریتیە لە لەبەرچاوگرتن، پلاندانان و بەڕێوەبردنی ئۆپەراسیۆن لە سەر بنەمای کاریگەرییەکانی هێزەکانی ژینگە وەکو سەرمای زستان گەرمای هاوین و بەکارهێنانی خاڵە بەسوودەکانی جوگرافیای ناوچەی پێکدادان.

٣ ) **بەرنامەی پەیوەست بە جموجوڵی سوپایی:** واتا لەبەرچاوگرتنی مەودا و ئەوەیکە ئایا پێوانی ڕێگاکە ئاسانە یاخود سەخت؟ ئەگەری مردن و فەوتان تا چی ڕادەیەکە؟ چۆن دەتوانیت باشترین ڕێگا هەڵبژێری؟

* دەبێت پێش بەڕێکردنی سەربازەکان باردۆخی زەوی (ڕێگاکان و بەرزی و نزمییەکان) بزانیت و بە زانینی مەودایش دەتوانیت ڕێگایەک هەڵبژێریت یان دابڕێژیت کە بە باشترین شێوە بگەیەنێتە ئامانج و شوێنی مەبەست.

* بە لەبەرچاوگرتنی ئەم زانیاری و پلانانە، دەتوانیت بەراوردبکەیت کە ئایا باشترە هێزی سوارە بەکاربهێنیت یاخود پیادە و دەبێت چی ئامێر و چەک و تەقەمەنییەکیان بۆ دابینبکەیت؟ و ئەگەر پێش بینیبکەیت لەکام ناوچە و چی شوێنێکدا ئەگەری پێکدادان هەیە، بە ئاسانییەوە دەتوانیت بزانیت کەی هێزەکانت کۆ و چڕ کەییش پەرش و بڵاویان بکەیتەوە.

٤ ) مەبەست لە **لێهاتوویی ڕابەری فەرماندەی سوپا**، ژیری، باوەڕ، ئازایەتی، یەکڕەنگی و بەجەرگی فەرماندەکانە.

* فەرماندە دەبێت ژیر بێت تا توانای تێگەیشتنی لەگۆڕانکارییەکانی باردۆخی تێدا هەبێت و بتوانێت ژیرانە بەرامبەر بە باردۆخی نوێ هەڵوێستی هەبێت. هەروەها فەرماندەیەکی شیاو و لێهاتوو دەبێت یەکڕەنگ بێت تاکو ژێردەستەکانی هیچ دوودڵییەک نەکەن و بزانن پاداشت و تەمێکانی بە بێ یەک و دوو جێبەجێ دەکات. بەڕاستی فەرماندەیەک لە

ڕابەریدا سەرکەوتوو دەبێت جیا لەم نیشانانەی باسکرا، ڕێز لە مرۆڤەکان دەگرێت، لەگەڵ لەکەسانی ژێردەستی بێت، لەکاتی گونجاودا هاودەردییان دەکات یاخود سوپاسی هەوڵ و کۆششەکانیان بەجێ بێنێت. لە هەمووی گرنگتریش ئەوەیە فەرماندەیەک ئازایەتی پێویستی تێدا نەبێت بەردەوام تووشی دوودڵی دەبێت و سوپا دوادەخات و دەبێتە هۆی ئەوەی کە سوپا لەکاتی گونجاودا نەتوانێت سەرکەوتن بەدەست بهێنێت. لەکۆتاییشدا جەختدەکەمەوە لەوەی ئەگەر فەرماندە، هەتەر و جیدی و ڕەق بێت، سەربازەکانی لە بەر هەیمەنەت و بەهێزی و توندوتیژییەکەی بە قسەی ئەکەن و لە تەمێی دەترسن.

* ئەگەر فەرماندەیەک ئازا و نەترس نەبێت ناتوانێت زاڵ بێت بەسەر دوودڵییەکانیدا و لەداڕشتنی پلانی گەورەیشدا نەتوانا دەردەکەوێت.

5) مەبەست لە پلان و هونەری جەنگی فەرماندەکان، توانای ڕێکخستن، چاودێری و ڕاسپاردنی پۆستی شیاو بۆ ئەفسەر و زابتەکان، دیاریکردنی یاسا و ڕێنماییەکان، دیاریکردنی ڕێگای جموجوڵ و پێش بینی خاڵە بنچینەیی گرنگەکانی پێویستی سوپایە.

* ئەم پێنج خاڵە لە چەکەکانی هەر فەرماندەیەکەو بە پاڵپشتییان، فەرماندەیەکی گەورە دەتوانێت سوپا هان بدات پشتگیری بن و ڕێز و حورمەتی لێبگرن.

* هیچ فەرماندەیەک ناناسم ئەم پێنج خاڵەی تێدا بێت و لە بەرەکانی جەنگدا سەرکەوتوو نەبووبێت و فەرماندەیەکیش کەمتەرخەم بێت لەم پێنج خاڵە، ئەگەر زیندوو بمێنن لەوانەیە گرنگییەکەی دەرکەوێت بۆیان.

* ئەگەر فەرماندەیەک ئەیەوێت بزانێت لە ئەنجامدا کام سوپا سەرکەوتوو دەبێت و کامیش شکست ئەهێنێت، دەبێت ئەو خاڵانەی ژمارەمان لە بەرچاو بگرێت و هەردوو سوپاکە بەوانە هەڵسەنگێنێت. (بەڵام دەبێت لە دروستی زانیارییە گەیشتووەکان بە تەواوەتی دڵنیا ببێتەوە، زۆر جار بووە فەرماندەی لێهاتوو بوونەتە قوربانی هەڵەبوونی ئەو زانیارییانەی پێیان گەیشتووە، و لەدوا جاردا سەریان لەگۆڕستانەوە دەرچووە!)

* ئەم دەرئەنجامە ئەگەر چی زۆر گەورەیە بەڵام زۆریش ئاسانە:

بۆ زانینی ئەوەی کام سوپا دەرئەنجام سەرکەوتوو دەبێت لە جەنگدا، بەس پێم بڵێن خەڵکی کام وڵات بڕوای زۆرتریان بە حکومەت هەیە؟ فەرماندەکانی کام سوپا لێهاتوویی و توانای زۆرتریان هەیە لە ڕابەری و ئاڕاستەکردنی سوپادا؟ کام سوپا توانای لۆجستی و ستراتیجی باشتری هەیە؟ کام سوپا سەرباز و ئەفسەرو زابتی پەروەردەکراوتری تێدایە؟ و کام فەرماندە لە بەخشینی پاداشت یان تەمێکردندا، لێزانی باشتری هەیە؟ (بە جۆرێک کە نەکەم بێت و نە زۆر!).

* سوپای بەهێز، سوپایەکە گالیسکەی قایم، ئەسپی خێرا، سەربازی گیان فیدا و چەکی تیژی هەیە. سەربازەکانی ئەم سوپایە بە بیستنی فەرمانی هێرش، خۆشحاڵ دەبن و بە فەرمانی پاشەکشێ دەگەڕێنەوە بۆ حەسانەوەو خۆبەهێزکردنی دووبارە.

لە بەر ئەمەیە ئوستاد *وانگ* دەڵێت: "ئەگەر ئەفسەر و زابتەکان لەگەڵ مەشق و ڕاهێنانی زۆر سەخت و هیلاکی ڕانەهاتبن، لەکاتی نەبەردا، دوودڵ و نیگەران دەبن و ئەگەر فەرماندەیەک بە تەواوەتی پەروەردە نەکرابێت، لەکاتی بەرەنگاری دوژمندا، ورەی دەڕوخێت."

* سۆن تزوو دەڵێت: ئەگەر فەرماندەیەک بەکار بێت کە ستراتیجی سوپایی من پەیڕەوبکات، بێگومان سەرکەوتوو دەبێت کەواتە ئەو لە دەست مەدەن. ئەگەر فەرماندەیەک بەکار بێنن کە متەرخەم یان بێ ئاگایە لە ستراتیجی سوپایی من، دڵنیابن شکست دێنێت کەواتە زوو لایدەن.

* سۆن تزوو دەڵێت: ئەگەر فەرماندەیەک لەگەڵ پلانەکانی من تێگەیشت، دەبێت هەل بڕەخسێنێت بۆ سەرخستنی ئەو پلانانە، ڕەخساندنی هەل بۆ سەرکەوتن لە هونەرەکانی فەرماندەیەکی لێهاتووە.

**فێڵ، بنەمای جەنگە.**

All warfare is based on deception.

*کەواتە لەکاتی بەتوانابووندا وا پیشان بدەن کە لاواز و بێ هێزن، کاتێکیش جموجوڵتان زۆرە و ئەکتیڤن خۆتان وا پیشان بدەن کە گوایە لە حاڵی خاوی و حەسانەوەدان.

کاتێک نزیکن، وەها بنوێنن کە زۆر دورن،

کاتێکیش دورن وەها بنوێنن کە زۆر نزیکن.

When near, make it appear that you are far away.

when far away, that you are near.

* دوژمن بخەنە تەڵەوە، بۆ نمونە سوپاکەتان سەر لێ شێواو و تێکچوو پیشان بدەن با ئەو وا هەست بکات مەترسی هێرشی لەناکاو لەسەری نییە ئینجا لەناکاو بە هەموو هێزتانەوە هێرش بکەنە سەری.

*کاتێک سوپای دوژمن کۆدەبێتەوە، خۆتان ئامادەی بەرەنگاری بکەن کاتێکیش دوژمن بەهێزە، خۆتانی لێلادەن.

خۆت بە لاوازی و ناتوانی بنوێنە تا دوژمنەکەت لە خۆبایی بکەیت.

Pretend inferiority and courage his arrogance.

* ئەگەر فەرماندەی دوژمنەکە لەڕەق و سەرکێش بێت، زوو تووڕە ئەبێت، ئێوەیش بێ ڕێزی و سووکایەتی پێ بکەن و تووڕەی بکەن و هەرکات تووڕە، وورگەڕا و بێ پلان بوو، سەرشێتانە و بە بێ ترس هێرش بکەنە سەری.

**فەرمانەکانی دوژمن تووڕە و سەرلێشێواو بکەن.**

Anger his generals and confuse them.

لە پێشینیانگێڕاوەتەوە: پاش سەردەمی حکومەتی *چاین* کەسێک بە ناوی *مائوتان* هەرکە گەیشتە دەسەڵات شوێن پێی خۆی پتەوکردەوە. لە هەمانکاتدا دەوڵەتی *هووی ڕۆژهەڵات*کە زۆر بەهێز بوو، باڵوێزێکی تایبەتی نارد بۆ دانوستانێکی دۆستانە. ئەوانگوتیان: "ئێمە ئەسپی بێ وێنەو زۆر خێرای *تائومائو*مان ئەوێت لێتان."

مائوتان لەگەڵ وەزیرەکانیکۆبووەوە، هەموویان دەستیانکرد هاوار هاوار و ناڕەزایەتی دەربڕین وگوتیان: "ئەسپی تائومائو؟ بێ وێنەترین دارایی وڵات؟" مائوتان لە وەڵامدا گوتی: "بۆ چی جووتێک ئەسپ لە دراوسێکەمان دریغی بکەین؟" پاشان ئەسپەکانی پێشکەشکرد.

پاش ماوەیەک دەوڵەتی هووی ڕۆژهەڵات دیسان باڵوێزێکی دیکەی نارد وگوتیان: "ئێمە ئاواتەخوازین یەکێک لە خاتووە شازادەکانی ئێوەمان هەبێت." مائوتان دیسان لەگەڵ وەزیرەکانی ڕاوێژیکرد. هەموویان بە تووڕەییەوە گوتیان: دەوڵەتی هووی ڕۆژهەڵات ئەوەندە بێ شەرم بووە داوای خاتووە شازادەکەمان دەکات؟ ئێمە داوات لێ دەکەین هێرشیان بۆبکە."

مائوتانگوتی: "چۆن مرۆڤ ئەتوانێت لە پێشکەشکردنی ئافرەتێکی جوان بە دراوسێکەی دریغی بکات؟" پاشان خاتووە شازادەکەی نارد.

دیسان پاش ماوەیەکیکورت باڵوێزەکان هاتنەوەوگوتیان: "ئێوە زەوی بێسوودی زۆرتان هەیە، ئێمە ئەوانەمان دەوێت."

مائوتان دیسان ڕاوێژی کرد. هەندێک لە وەزیرەکان لەگەڵ پێدانی زەوییەکان بوون و هەندێکیش نا. مائوتان بە تووڕەییەوە گوتی: "زەوی، بنەما و بنچینەی وڵاتە، کێ ئەتوانێت زەوی پێشکەش بکات؟" پاشان هەمووی ئەو وەزیرانەی کوشت وا لەگەڵ پێشکەشکردنی زەوی بوون. ئینجا خۆی هەڵدایە سەر ئەسپەکەی و فەرمانی دەکرد هەر کەسێک بە جێ ما بیکوژن، و لە ناکاو هێرشی بردە هووی ڕۆژهەڵات و ئەودەوڵەتەی لەناوبرد.

پاش ئەم کارە مائوتان هێرشی کردە سەر *یواتی* و هەموو سەرزەمینی با و باپیرانیشی وەرگرتەوە.

* ژن وەک نچی جوان پێشکەشی دوژمنەکەن تا بیخەنە باسی دڵدارییەوە. هەوریشم و زەروت و بەرەی بەنرخی پێشکەش بکەن تا هەستی خۆ بە زل زانینی تێدا بجولێنن.

دوژمن بخەنە ژێر گوشارەوە و بە هێرشی بەردەوام لاوازی بکەن.

Keep him under a strain and wear him down.

*دوژمنەکەت لەکاتی حەسانەوەدا ئازار بدە و ماندووی بکە.

**لە پێشینیان گێڕاوەتەوە:** لە کۆتاییەکانی سەردەمی *هان*، پاش ئەوەی *سائۆسائۆ* زاڵ بوو بە سەر *لیۆپێ*، پێ هەڵهات بۆ شائۆو لەوێدا بۆ جەنگ بەرامبەر سائۆسائۆ سوپایەکی کۆکردەوە.

لەم کاتەدا یەکێک لە ئەفسەرە زیرەکەکانی پێشنیازێکی کرد وگوتی: "لە بەر ئەوەی سائۆسائۆ لە بەکارهێنانی جەنگاوەرەکاندا زۆر لێهاتووە، نابێت بە بێ پلانێکی تۆکمە بەرەنگاری ببینەوە کەواتە من پێشنیاز ئەکەم هیچ کارێک باشتر نیە لەوەی ئێمە ماوەیەک جەنگ دوا بخەین و سائۆسائۆ لە خۆمان دوور بخەینەوە. ئێوە لەم ماوەدا لە ناو دڵی کێوەکان و بە درێژایی ڕووبارەکاندا شوێنی سوپایی دامەزرێنن و لەگەڵ ڕابەرەکانیتر پەیمانی یەکگرتن واژۆ بکەن و لە ناوچەکەدا، ستراتیجییەکی سوپایی دابڕێژن و لەوێ پیاوە سوپاییەکان لەگەڵ خێزانەکانیاندا جێگیر بکەن تاکو بتوانن بەردەوام لە دوژمن بدەن و وەڕەزی بکەن.

یەکەم جار لە لای ڕاستەوە هێرشەکەن وکاتێک سوپای *سائۆسائۆ* سەرقاڵی ئەوێیە، لە لای چەپەوە هێرشی بۆ بەرن و هەرکە ذاڵە لاوازییەکانی دوژمن دەرکەوت لە ئەو لایەوە هێرشی بۆکەن. ئاوەها جەنگاوەرەکانتان هەمیشە پڕوزە و گەشاوە دەمێننەوە بەڵام سوپاکەی *سائۆسائۆ* دەکەویتە ژێرگوشارێکی بەردەوامەوەو بەرەو لاوازی و تێکچوون دەڕوات. ئەگەر ئاواکەن سەرکەوتن بۆ ئێوەیە ئەگەر نا پەشیمان دەبنەوە."

ئەو ئەم ڕێگایەی ئەگرتە بەر و سائۆسائۆ بە تەواوەتی زاڵ بوو بە سەریدا.

کاتێک هێزەکانی دوژمن یەکگرتوون، لێک دایان بڕن.

When he is united divide him.

* هەندێک جار لێک دابڕان بخەنە نێوان سەرکردەو وەزیرەکانی و هەندێک جاریش هێزە هاوپەیمانەکانی لێ جیا بکەنەوەکاریکەکەرگەمان لە یەکترکەن کاتێک لە یەک دابڕان، ئەتوانن هێرشکەنە سەریان.

هێرش ببەنە شوێنێک خۆیان بۆ بەرگری لەوێ ئامادە نەکردووە

کاتێک هێرشکەرەکە لەو بڕوایەدا نین هێرشکەن

هەمیشە زۆر بە خێرایی وکتوپڕ هێرشکەن.

Attack where he is unprepared, sally out when he does not expect.

لە پێشینیانگێڕاوەتەوە: *لی چینگ* هکو فەرماندەی سوپایەک دانرا تاکو هێرشبکاتە سیائوسیە. پاش هەشت مانگ ئەو هەموو هێزەکانیکۆکردەوە. لە بەر ئەوەی وەرزی پاییز بوو و لافاوی ڕووباری یانگ تسە بووە هۆی ئەوەی تێپەڕبوون لە هەموو ڕێگاوبان و دۆڵەکان مەترسیدار بێت، سیائوسە دڵنیابوو لەوەی لێرەوە هێرشی بۆ ناکرێت و هەر بۆیە هیچ ئامادەکارییەکی لەم شوێنەدا نەکرد. یەک مانگ دواتر *لی چینگ*گوتیە سەربازەکانی: "ئەوەی لە جەنگدا زۆرترینگرنگی هەیە، خێرایی باوەڕنەکراوە. مرۆڤ نابێت بێ ئاگا بێت لە هەلێکی ڕەخساو، بەڵکو دەبێت بە باشترین شێوە لە دەرفەتەکانکەڵک وەربگرێت. ئێستاکە سیائوسە بێ ئاگایە لە بوونی ئێمە لێرەو چاوەڕوانی هێرشی ئێمە نییە، ئێمە دەتوانین بە شێوەیەکی لەناکاو وکتوپڕ بیخەینە مەترسی ڕووخانی حکومەتەکەیەوە. پێشینیانگوتویانە: کاتێک دەنگی هەورەتریشقە هات، دەرفەتی پە نجە لەگوێ خستنت نامێنێت."

لە ئە نجامدا سیائوسە زۆردەرنگ لە بوونی ئەوان بەئاگابووەوە و لە بەکوی ڕووبارەوەداوای هێزی یارمەتیکرد، بەڵام ئەو هێزەدرەنگگەیشتن و سیائوسەدانی بە شکستی خۆیدا نا.

* بۆ سەرکەوتن ناتوانیت هەموو ئەو باسانەیکردمان یەک بە یەک بخەیتە بەردەست و باسیانبکەیت، ئەمانە بەس هزر و ڕێنوێنییە بۆ فەرماندەی ستراتیج.

* لەکاتی بەرەنگاربوونەوەی دوژمن دا، بەگۆڕینی شوێنەکەتان، پەرچەکردارتان هەبێت و ژیرانە پلاندابڕێژن.

سەرکەوتن لە ئە نجامی هەڵسەنگاندنی زۆر و بەردەوام،

شکستیش لە ئە نجامی هەڵسەنگاندنیکەمدا ڕوودەدات.

With many calculating, one can win;

With a few one cannot.

* تا ئێستا باسی هێز و هەڵسەنگاندنمان کرد کە لە ئەنجومەنی ڕاوێژکارانی جەنگدا پێش لە هەر ئۆپەراسیۆنێکی جەنگی باسیان لێ دەکرا، ئەمکارەمان بۆ ئەوە کرد بزانین هەڵسەنگاندن، توانا و هێزمان بەرامبەر بە دوژمن ڕوون دەکاتەوە. ئەوکەسەی هیچ هەڵسەنگاندنێک ناکات، بە دڵنیاییەوە بەختێکی کەمتری هەیە بۆ سەرکەوتن.

* من پێش هەرکارێک، بە تەواوەتی بارودۆخەکە هەڵدەسەنگێنم و ئەنجامی نەبەردەکە پێش بینی دەکەم.

* بەگشتی بەڕێخستنی جەنگ لەکاتێکدا ژیرانەیەکە پاشکەوتی وڵاتگەیشتبێتە لوتکەو ئەمبارەکان پەسمەندەیەکی‌دەیان ڤات زۆرتر لە پێداویستی ساڵانەیان تێدا بێت و پلان‌دارێژی لێزان لە بەردەستدا هەبێت.

* ناسینی چەکی ستراتیجی و دابینکردنی جۆری‌کوالێتی بەرزی ئەم چەکانە، زۆرگرنگە و دەبێت فەرمانەکان لەبەرچاوی‌بگرن، لە بەر ئەوەی هەمیشە لە نەبەردەکاندا، چەکە نوێکان، زۆر بەکەڵک‌دێن و بەسوودن.

* سەرکەوتن، ئەنجامی سەرەکی هەر نەبەردێکە و ئەگەر دەستگیرکردنی ئەم ئەنجامە زۆر بخایەنێت، چەکەکان‌کول و نەکارامەدەبن، ورەدائەبەزێت و جەنگاوەرەکانیش بێ‌هیوا و هیلاک‌دەبن.

جەنگە درێژخایەنەکان، هیچ ئەنجامێکیان نییە جگە لە مل‌شۆڕی.

Protracted campaigns have no result other than disgrace.

*کاتێک لە ئەنجامی جەنگە درێژخایەنەکاندا چەکەکان‌کول، جەنگاوەرەکان هیلاک، پەسمەندەکان‌کەم و وڵات بێ پارە بوو، دراوسێکان ئەم بارودۆخە وەکو هەل بۆ خۆیان ئەقۆزنەوەو و ئێوەش هەر چەندە ڕاوێژکاری لێهاتوویشتان هەبێت، ناتوانن پلانێکی‌کارامە بۆ نەجاتی خۆتان‌دابڕێژن.

**ئۆپەراسیۆنێکی ژیرانەی جەنگی نابێت‌درێژخایەن بێت.**

هێرش، ئەكرێت بلیمەتی تێدا نەبێت

بەڵام هەر ئەبێت خێراییەكی لەڕادەبەدەر و لە سەرەوەی ئاستی سروشتی تێدا هەبێت.

An Attack may lack ingenuity,

but it must be delivered with supernatural speed.

* مێژوو تا ئێستا جەنگێكی درێژخایەنی بەخۆیەوە نەبینیوەكە وڵاتێك توانیبێتی قازانجێكی زۆری تێدا دەست بكەوێت.

ئەوانەی واز لە چەك ناهێنن، دەبنە ڕاوی چەكەكانیان.

Those who will not put aside weapons,

are themselves consumed by them.

* ئەوانەی ناتوانن لە جەنگ تێبگەن، ئەبەد ناتوانن ڕێگایەك بۆ سەركەوتن تێیدا بدۆزنەوە.

* ئەوانەی لە دەستپێكردنی جەنگدا، زیرەك و لێهاتوون، ئەبەد پێویستیان بە دیسان خۆسازكردن و بودجەدانانی دووبارە نییە.

* ئەگەر سوپا بەس چەك و تەقەمەنییەكانی بگوازێتەوەو و بۆ خۆراك چاوی لە خۆراكێك بێت لە ناوچەی دوژمن دەستی ئەكەوێت، هەمیشە خۆراكێكی زۆری دەكەوێتە بەردەستی و پێی دەگات.

* حکومەت لەبەر زنجیرە پێکدادانێکی جەنگی لاواز دەبێت، و ناردنی تفاق و خۆراک بۆ مەیدانی دوور خەڵک لاواز و لاوازتر دەکات، بۆیە کارێک دەکەن دەستەکانی هێرشبەر لە بواری تفاق و خۆراکەوە پشت بە خۆیان ببەستن تاکو لە ئەنجام و بەرهەمی هێرشەکانیان بەهرەمەند بن.

* ئەگەر ئۆپەراسیۆنێکی جەنگی لە مەیدانێکی دووردا جێبەجێ بکرێت و تفاق و خۆراکەکەی لە ناوەندی حکومەتەوە بۆ دابین بکرێت، ئەم پشتپێبەستنە ئەبێتە سەرئێشە و جەنگاوەرەکان لاواز و ماندوو دەکات.

* هەر چەندە جەنگاوەرەکان زۆرتر پشت ببەستن بە تفاق و خۆراکەوە، تەمبەڵ تر و لاوازتر دەبن، و بۆیە ئەگەری شکستیش زۆرتر دەبێت.

* هەڵاوسان و جەنگ هەمیشە پێکەوە بوونە. هەڵاوسان هۆی نالەباری ئابوورییە و نالەباری بارودۆخی ئابووریش هەمیشە دەبێتە هۆی لاوازی و تۆرانی خەڵک یاخود لە نێوان هەندێکەسدا تەماحی دەستخستنی داهاتی زەبەلاح دروست دەکات.

*کاتێک گەنجینە بەتاڵ بووە و هێز ڕوو لە کەم بوونەوە دەکات ئاستی بەهرەمەندی بە شێوەیەکی بەرچاوو زۆر دیار کەم ئەکات و تەنانەت تا ٧٠٪ی سەرچاوەکان ئەفەوتێن.

* فەرماندەیەکی گەورە دەزانێت چۆن سەرچاوەکان و چەک و تەقەمەنی و ... لە دوژمن دەست بخات و بەم کارە ٦٠٪ی خەرجەکانی جەنگ کەم بکاتەوە. بەها و بایەخی ئەو تفاقانەی لە دوژمن دەست ئەکەوێت بیست ئەوەندەی بەهای ڕاستەقینەیەتی.

* لەگواستنەوەی تفاق و خۆراک بۆ مەیدانی دووردا، بەگشتی لە هەر بیست یەکە، بەس یەکێکیان دەگاتە شوێنی مەبەست لەبەر ئەوەی نۆزدە یەکە خەرجی گواستنەوە دەکرێت.

* یەکێک لە ڕێگەکانی گرنگ بۆ سەرکەوتن بە سەر دوژمندا ئەوەیە جەنگاوەرەکان دژی دوژمن هان و ختێنە بدەیت.

لە پێشینیان گێڕاوەتەوە کاتێک سوپای *یەن* گەماڕۆی *چیمۆی* دا، لووتی دیلەکانی بڕی. لەبەر بێڕەحمی ئەوان، خەڵکی *چیمۆ* بە توندی بەرگرییان کرد تاکو تووشی ئەشکەنجەی ئاوەها نەبنەوە، هەر وەها فەرماندەکەیان هەندێک سیخوڕیان نارد ئەم دەنگۆیە لە ناو *یەن*دا بڵاوبکەنەوە کە گوایە ئەگەر *یەنییەکان*، مردووی *چیمۆییەکان* لەگۆڕ دەربێنن، *چیمۆییەکان* ورەیان ئەڕوخێت کاتێک *یەن* ئەم کارەی کرد و جەنگاوەرەکانی *چیمۆ* لە ڕیشەی کردارەکە بێ

ئاگابوون، زۆر تووڕە بوون و بە چاوی پڕ فرمێسکەوە ئاواتی جەنگیان خواست. فەرمانەکەیان وا ئەم ژیرییەی بەکار هێنابوو بە هێرشێکی کتوپڕ *یەنی* لەناودا بە تەواوەتی شکستی پێی هێنا.

* جەنگاوەرەکان تالان ئەکەن لە بەر ئەوەی بیر لە دەوڵەمەندبوون ئەکەنەوە.

لە پێشینیانەوە گێڕاوەتەوە کاتێک هیانگ هێرشی کردە یا خیبەکانی پویانگ و هونگ، سێ سەربازگەی ئەوانی گرت لەگەڵ گەنجینەیەکی گەورەیانیشی تالان کرد. بەڵام هێشتا یا خیبەکان بە تەواوەتی سەرکەوت نەکرابوون و ژمارەیان زۆر و بەهێز بوون. جەنگاوەرەکانی هیانگ کە ئیتر دەوڵەمەند ببوون هیچ هاندەرێکیان نەمابوو بۆ جەنگ. هیانگ ئەم کێشەیەی بینی و جەنگاوەرەکانی هاندا بۆ خۆشگوزەرانی و ڕاوکردن کاتێک ئەوان خەریکی ڕاو بوون کەسانێکی نارد تا ئاگر بەردەنە گەنجینەکە کەسێک لە جەنگاوەرەکان نەمابوو لە کاتی گەڕانەوەدا نەگریا بێت. لەم ساتەدا هیانگ وەکو ڕابەر دەرکەوت و گوتیە جەنگاوەرەکانی: بۆ چی ئاوەها زەلیلانە ئەگرین لە کاتێکدا ئەوەندەی ئەو گەنجینەیە لای دوژمنەکەتانە و بەشی خۆتان و جیلی داهاتوویشتان ئەکات. جەنگاوەرەکان هەرکە ئەم قسەیانە بیست زوو ئامادەی جەنگ بوون و دەمەو بەیانی چێشتێککە پێشتر ئامادەکرابوو (بۆ ئەوەی پێشتر ئامادەکرابوو دووکەڵی ئاگر شوێن و جموجوڵیان ئاشکرا نەکات) خواردیان و هێرشیان دەستپێکرد و تا سەرنەکەوتن ڕانەوەستان.

فەرماندەیش گوتی: لە هەمووی ئەو شارانەی تالان ئەکرێن، بە ناوی منەوە گەنجینەکان تالان ئەکەن و لە نێوان کەسەکان و جەنگاوەرەکاندا دابەشیان ئەکەن.

* لە جەنگی گالیسکەکاندا، ئەگەر زۆرتر لە دە گالیسکەتان دەست خست پاداشتی یەکەم سەرکەوتوو بدەن و گالیسکەکانی دوژمن لە ژمارەیەکی زۆردا بەکار بێنن.

* لەگەڵ دیل و پەنابەرەکان، چاک بن و بیانپارێزن. لەگەڵ هەموو سەربازە دیلەکان جوامێرانە و بەڕێزەوە هەڵسوکەوت بکەن. بەم کارە لەوانەیە بتوانن کەڵکیان لێ وەرگرن و بەس بەم جۆرە ئەتوانن هونەری جەنگاوەری وەکو هۆکارێکی سەرکەوتن و بەهێزبوون بزانن.

* هەمیشە ئاگادار بە "ئامانج لە جەنگ، سەرکەوتنە نەک بەڕێخستنی زنجیرەیەک ئۆپەراسیۆنی درێژخایەن"، ئەو فەرماندەیەی لەم خاڵە تێگەیشتبێت، بەختەوەری گەورەیی نەتەوەکەی مسۆگەر ئەکات.

ئەوەی هەر حکومەتێک دەیەوێت ، بەس زەوییە .

What the state wants is only the land.

* داگیرکردنی وڵاتی دوژمن بە بێ کاولکاری و وێرانی، بەگشتی سیاسەتێکی باشە، هەر بەو جۆرەی پێشینیان گوتیانە: "**هێزی خۆتان بۆ کوشتن بەکارمەهێنن**".

* بە زیندوویی گرتنی جەنگاوەرەکانی دوژمن، باشترە لە کوشتنیان و بریندارکردنیان.

سەد سەرکەوتن لە سەد جەنگدا، لوتکەی لێزانی و لێهاتوویی فەرماندە نییە،

لوتکەی لێزانی و لێهاتوویی فەرماندە لەوەدایە بە بێ جەنگ دوژمنەکە چی خۆیبدات.

To win one hundred victories in one hundred battles is not the acme of skill,

To subdue the enemy without fighting is the acme of skill.

گەورەترین بەشی جەنگ، هێرش بردن بۆ "ستراتیجی"دوژمنە.

What is of supreme importance in war is

to attack the enemy’s strategy.

پلانەکانی دوژمن، هەر لە سەرەتایانەوە، بخە بەرهێرشت.

Attack plans at their inception.

لە پێشینیان گێڕاوەتەوە کوهسون، وڵاتی چان ی خستەگەمارۆوە. چان ئەفسەرێکی ڕاوێژکاری پلاندانانی بە ناوی *هانگ فوو ون* بۆ دانوستان نارد کوهسون بە بیانوی دەم سووری و بێڕوویی، ملی پەڕاندو چان ی ئاگادارکردەوە کە: "ئەفسەرەکەی تۆ بێ ئەدەب بوو و منیش ملیم پەڕاند، ئەگەر ئەتەوێت خۆت بدەی بە دەستەوە خێراکە، ئەگینا لە خۆت بەگیری بکە." لە هەمان ڕۆژدا چان دەری هەموو سەربازەکانی خۆی بۆ کوهسون کردەوە. هەموو فەرمانەکانی کوهسون بە سەرسوڕمانەوە پرسیاریان کرد: "ئەتوانین پرسیار لە بەڕێزت بکەین ئەوە چۆن ناردەی چانت نەکوشت و کارێکت کرد خۆیشی بدات بەدەستەوە؟"

کوهسون وەڵامی دایەوە: هونگ فوو ون دەستی ڕاست و نزیکترین ڕاوێژکاری چان بوو. ئەگەر من ئەوم نەکوشتبا، ئەو لەوانەیە پیلانەکانی خۆی جێبەجێ بکردایا. بەڵام کاتێک ئەوم کوشت، چان ورەی ڕووخاو هەر بەو جۆرەی پێشینیان گوتویانە: "**باشترین ستراتیجی لە جەنگدا، هێرش بۆ پلانەکانی دو ژمنە**".

* ذاڵگەکی حیکە تێکدانی یەکگرتوویی دوژمنە. لەم بوارەدا پێشینیان گوتویانە: مەهێڵن دوژمنەکانتان یەک بگرن، هەمیشە بزانن کاتێک دوژمن هاوپەیمانانێکی هەیە کێشەکەتان زۆر گەورەتر و هەڵوێستی دوژمنیش زۆر بەهێز و بتەو دەبێت.

* قۆناغی حیکە، هێرشە بۆ سوپای دوژمن.

کەسێک بۆ سەرکەوتن بەس پشت بە هێزی چەک دەبەستێت، فەرماندەیەکی شیاو نیە.

He who struggles for victory depending on blades,

is not a good general.

جەنگ کارێکی مەترسیدارە.

Battles are dangerous affairs.

بەس ئەوکاتەی نەتتوانی پلانەکانی دوژمن هەر لە سەرەتایانەوە لەناو بەریت یان یەکگرتوویی نێوان هێزەکانی تێکبدەیت، چەکەکانت تیژبکەوە.

* خراپترین سیاسەتی هەر فەرماندەیەک، هێرش بردن بۆ شارەکانی دوژمن و خستنی سیڤیلە، ئەمکارە بەس لە نەچاری و زەرووردا دەبێتبکرێت.

* بۆ ئامادەکردنی سوپا بۆ نەبەرد، لانیکەم شەش مانگکات پێویستە.

سەرکەوتن بە بێ خۆڕاگری نابێت.

Victory without patience is impossible.

* ئەگەر فەرماندەیەک خۆگر نەبێت و لەکاتی ناڵەباردا فەرمانی هێرش بداتە سەربازەکانی، دڵنیابە یەک لە سێی هێزی سوپاکەی بە بێ هیچ دەستکەوتێک ئەفەوتێت.

**لە پێشینیان گێڕاوەتەوە:** ئیمپراتۆرێک سەد هەزار جەنگاوەری بە چەک و تفاقی زۆرەوە نارد بۆ هێرش بردنە سەر سەردارێک و دەگیرکردنی شارەکەی، پاش ئەوەی سوپاکە لە شار نزیک بوونەوە، ئیمپراتۆر وەکو نەریتێکی کۆن داوای شەڕابی کرد و ئەگەر سەردارەکە شەڕابی بۆ ئیمپراتۆر بناردایا، واتا خۆی دەدات بە دەستەوە. بەڵام سەردارەکە لە وەڵامدا پەرداخێک میزی بۆ ئیمپراتۆر نارد. ئیمپراتۆر زۆر تووڕە بوو و بە بێ هیچ پلاندانانێک فەرمانی هێرشی دەکرد. سەربازەکانی وەکو دەستەی مێروو لە شوورای شارەکە سەرئەکەوتن و ئەکوژران و ئەوەندەیان لێ کوژرا پاش سێ ڕۆژ بەرزی تەرمەکانیان گەیشتە بەرزی شوورای شارەکە. پاش سێ ڕۆژ، ئیمپراتۆر نیوەی سەربازەکانی خۆی بەکوشتن دا بێ ئەوەی هیچێکی دەستبکەوێت.

* باش بزانە، مامۆستایانی هونەری جەنگی، سوپای دوژمن بە بێ جەنگ ئەخەنە ژێرکێفی خۆیانەوە و شارەکان بە بێ هێرش دەگیر ئەکەن و حکومەتی دوژمن بە بێ ئۆپەراسیۆنی ئاڵۆز و درێژخایەن لەناودەبەن.

**لە پێشینیان گێڕاوەتەوە:** "لەکاتی گەمارۆیەکی بۆ درێژخایەندا، ئەفسەرێک پێشنیازێکی ئاراستەی فەرماندەکەی کرد وگوتی: درێژەدان بەم گەمارۆیە هیچ قازانجێکی بۆ ئێمە نیە و هیچ ستراتیجییەکی تێدا نیە، بۆیە من پێشنیاز ئەکەم باشترە گەمارۆکە بشکێنین و بهێڵین خەڵک بزانن ڕێگای هەڵهاتنیان هەیە، بەمکارە دوو بەرەکی ئەکەوێتە نێوانیانەوە و ئیتر سەد سەربازمان بەسە بۆگرتنی شارەکە."

* هونەری داڕێژانی پلانی هێرش لەوەدایەکە ئامانجی فەرماندە، دەگیرکردن و دەست بەسەرگرتنی هەموو شتەکان دەژ و سەربەمۆر بێت، ئاوەها جەنگاوەرەکان ماندوو نابن و فەرماندەیش دەگیرکەرێکی بە تەواوەتی بێ عەیب دەبێت.

سۆن تزوو دەڵێت: لە بواری هونەری بەکارهێنانی جەنگاوەرەکاندا ئەم خاڵانە لەبەر چاوبگرن:

* ئەگەر توانا و ژمارەی جەنگاوەرەکانتان پێنج بەرانبەری دوژمنە، هێرشی بۆ بکەن. لەم حاڵەدا دەبێت دوژمن تێبگەیەنن کە ئەتانەوێت لە بەرامبەرەوە هێرشی بۆ ببەن. ئینجا لە ڕۆژهەڵاتەوە هێرشێکی لاوازی بکەن و بیکەنە هێرشێکی زۆر قورس و لە لای ڕۆژئاواوە هێرشێکی کتوپڕی بۆبکەن و ناتوان و سەرلێشێواوی بکەن.

* ئەگەر هێزەکەتان دوو بەرانبەری دوژمنە، هێزەکانتان بکەن بە دوو بەشەوە و لە دوو قۆڵەوە هێرشی بۆ بکەن.

* ئەگەر هێزەکەتان بەرانبەری هێزی دوژمنە. هەوڵ بدەن بە بەکارهێنانی چەند ستراتیجی جیاواز، دابمەزێننەوە و بەسەریدا سەرکەون. لەم حاڵەدا بەس فەرماندە لێهاتووەکان توانای سەرکەوتنیان هەیە.

* ئەگەر لاوازترن لەدوژمن، خۆتان لە جەنگ دووربگرن و تا تەواوی هێزەکەتان لەدوژمن تووڕە نەبوونە، تادواسات خۆبگرن بکەن.

* ئەگەر هێزەکانتان زۆر لاوازترن لە هێزەکانی دوژمن، هەموو هەوڵی خۆتان بخەنەگەڕ بۆ ئەوەی شایانی ڕێز بن بۆ ئەوەی هێزەگەورەکان تاڵانتان نەکەن.

* فەرماندەدەبێت فەرمانەکانی بە ڕوونی و میرایەتییەوەدەربڕێت تەکو سوپا تووشی سەرلێشێواوی نەبێت.

سوپایەکی سەرلێشێواو، یارمەتیدەری دوژمنە بۆ سەرکەوتن.

A confused army leads to another victory.

ئێستا پێنج ڕێگا بۆ پێش بینی سەرکەوتن دەخەینە بەردەست:

١) سەرکەوتن بۆ فەرماندەیەکە بزانێتکەی ئەتوانێت جەنگبکات کەی ناتوانێت.

٢) سەرکەوتن بۆ فەرماندەیەکە بزانێت چۆن لە جەنگاوەری لاواز و هەروەها لە جەنگاوەری بەهێزکەڵک وەربگرێت، لەبەر ئەوەی لە جەنگدا بارودۆخگەلێکی زۆر هەیەکە بەهێز ناتوانێت زاڵ بێت بەسەر لاواندا و لاواز زاڵ ئەبێت بەسەر بەهێزدا.

٣) سەرکەوتن بۆ فەرماندەیەکە پەیوەندییەکی زۆر بتەو لە نێو ڕیزەکانی سوپاکەیدا هەبێت بۆگەیشتن بە ئامانجەکان.

٤) سەرکەوتن بۆ فەرماندەیەکە کە ئەوەندە وریا بێت هەر سات ئامادەی بەرەنگاری بێت بەرامبەری دوژمنی خەیاڵی.

٥) سەرکەوتن بۆ ڕابەرێکە فەرمانەکانی بێ دەستێوەردانی کەسی ئەو بتوانن سەرکەوتن بەدەست بێنن.

کە واتە دەڵێم:

ئەگەر خۆت ودوژمنەکەت بناسیت، تەنانەت لە سەد جەنگیشدا ناکەویتە مەترسییەوە.

Therefore I say:

Know the enemy and know yourself, in a hundred battles you will never be in peril.

*کاتێک سوپاکەت باش بناسیت وهیچ بیرێکت لە تواناکانی دوژمن نەکردبێتەوە، ٥٠٪ ئەگەری سەرکەوتنت هەیە.

* ئەگەر نە هێزی خۆت بناسیت و نە هێزی دوژمن، دڵنیا بە تووشی شکستێکی زۆر قورس دەبیتەوە.

* لە سەردەمی کۆندا، جەنگاوەرە کارگەرییەکی تایبەتیان بە دوو باس دەدا یەکەمیان ئەوە بوو چۆن خۆیان بپارێزن و ئاسایشیان دابین بکەن، دووەمیش ئەوە بوو چاوەڕوانی دەرفەتێکی باش بکەن دوژمن بکەوێتە بارودۆخێکی نالەبار یاخود شوێنێکی خراپەوە بۆ ئەوەی هێرشی بۆ بکەن.

* ئاسایش و پارێزراوبوونمان بە خۆمان بەستراوەتەوە، بەڵام شکست باری (Vulnerability) و نەبەزێنی دوژمن بە کارەکانی دوژمن بەستراوەتەوە.

ئەوەی بە من بەستراوەتەوە ئەتوانم بیکەم،

بەڵام دڵنیا نیم لەوەی بەستراوەتەوە بە کارەکانی دوژمن.

That which depends on me, I can do.

That which depends on the enemy, cannot be certain.

لەوانەیە کەسێک هونەری سەرکەوتن بزانێت، بەڵام مەرج نییە بزانێت چۆن کاری پێ بکات و سەرکەوتووی بەرەی جەنگ بێت.

One may know how to win, but cannot necessarily do so.

شکست نەهێنان بەستراوەتەوە بە چۆنێتی بەرگریکردن،

ئەگەری سەرکەوتن بەستراوەتەوە بە چۆنێتی هێرشکردن.

Invincibility lies in defense;

the possibility of victory in the attack.

* ئەوکەسەی توانایەکی لەبار و شیاوی تێدا نیە باشترە لە بەرگریدا بێت و ئەوکەسەیش توانای زۆرە، باشترە هێرش بکات.

* ئەوانەی بلیمەتی بواری بەرگرین کە بتوانن خۆیان لەکاتی بەرگریدا وەها حەشار بدەن دەڵێی لە توێکڵەی نۆیەمی ژێری زەویدا خۆیان شاردۆتەوەو، ئەوانەیش بلیمەتی بواری هێرشن کەکاتێک بە نیازی هێرشن، وەها هەڵدەنە سەر دوژمن کە دەڵێی لە ئاسمانەوە وەکو هەورە تریشقە هاتوونەوە سەری و نەهێڵن دوژمن بزانێت لەکام لاوە خۆی بتەو بکاتەوە و بەرگری بکات.

*کەواتە فەرماندەیەکی لێزان، خۆی ئەخاتە بارودۆخێکەوە نەڕووخێت و هیچ دەرفەتێکیش بۆ زاڵ بوون بە سەر دوژمندا نافەوتێنێت.

* لە خاڵە هەرەگرنگ و پێویستەکان بۆ هەر فەرماندەیەک، تێگەیشتنی دروست لە شوێن، هەرەوەرزی سوپا، ستراتیجی قووڵ لەگەڵ پلانی درێژخایەن، تێگەیشتن لە بارودۆخ و هەلە ڕەخساوەکان و توانای تاقیکردنەوەی هێزی مرۆڤایەتییەتی.

* فەرماندەیەک نەتوانێت تواناییەکانی خۆی هەڵسەنگێنێت، یان لەکاتی ڕەخسانی هەلەکەو نجاودا، خێرایی و نەرمی شیاوی نەبێت، لەرزۆک و دوودڵانە بەرەنگاری دوژمن ئەبێتەوەوگەمژانە بەس چاو ئەبڕێتە هەواڵی پشتڕاست نەکراو، ساتێک فەرمانی هێرش دەردەکات و ساتێکی تر فەرمانی پاشەکشێ دەدات. فەرماندەیەکی ئاوەها ئەبێتە هۆی پەرشوبڵاوبوونی سوپا و وەکو جەلادێکە خەڵکەکەی دەستەدەستە ئەخاتە داوی مەرگەوە.

* بەس لەبەر پێکهاتەی سوپاییەکە فەرماندەی سەرکەوتوو ئەتوانێت خەڵکەکەی بە شێوازی کاریگەر بنێرێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمن.

سروشتی پێکهاتەی سوپا لە سروشتی ئاو دەچێت، لە بەرزایی سڵ ئەکات و بەرەو نزمایی خۆی هەڵدەدات کەواتە فەرماندە ئەبێت هێزی سوپاکەی بە خۆڕگرییەوە، وەکو ئاو لە پشتی بەنداودا ڕابگرێت و لەکاتی گونجاو بەری بداتە سەر دوژمن. هێزی سوپایش لە هێزی ئاو دەچێت، ئاو بەس بەرەو نزمایی و شوێنی بێ ئامادەکاری و خاڵی لاوازی هێرش دەبات.

کاتێک هێرشی بۆ بەرەکە چاوەڕوانی نیە،

خۆت لە خاڵە بەهێزەکانی دووربگرە وەهەکە خاڵە لاوازەکانی،

ئاوەها وەکو ئاو دەبێت کەس توانای بەرەنگاربوونەوەتی نیە.

Attack him when he does not expect it;

Avoid his strength and strike his emptiness,

And like water, none can oppose you.

* بەکورتی، بەڕێوەبردن لە ڕێکخستندایە. هێزی پێویست بۆ بەڕێوەبردنی گروپێکی بچوک، بەرامبەری هێزی پێویستە بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵێکی زۆر.

لە پێشینیان گێڕاوەتەوە: بۆ بەڕێوەبردنی سوپایەک، سەرەتا دەبێت فەرمانەکان و یاریدەدەری فەرمانەکان دیاری بکرێن و پاشان پلەی سوپاییەکان دیاری بکرێت. بچوکترین پلەکان دابەش بکەین گروپی دوو و سێ کەسی و کەسێک بکەینە بەرپرس و بان دەستیان، هەر دوو گروپێکیش بخەینە ژێر فەرمانی بەرپرسێکی باڵاوە. بە جۆرێک لە ئەم دیگرامەی خوارەوەدا دەیبینین:




* ئارایشتی ڕێکخراوەیی و فۆرمی فەرمانەکان گرنگترین شتێکە توانایی ئەوە دەداتە فەرماندەیەک گروپێکی زۆر بە جۆرێک بەڕێوەببات دەڵێی گروپێکی بچوکە.

کاتێک جەنگاوەرەکان بۆ نەبەرد لە فەرماندە دوور ئەکەونەوە، توانای بینین و بیستنیان زۆر کەم ئەبێتەوە کەواتە تەنیا ئامێری پەیوەندی نێوان فەرماندە و جەنگاوەرەکان، لە ڕێگەی ئاڵاکان و درەوشەی سوپایی و شەیپوورە و هەموو جەنگاوەرەکان لە پێشدا دەبێت بە باشی ئەم شێوازی پەیوەندی کردنە فێرکرابن.

* ئەگەر سوپا بیەوێت هێرشی دوژمن بێ شکستێکی سامناک دوور بخاتەوە، پێویستە لە دوو جۆر هێزی ئاسایی و تایبەت کەڵک وەربگرێت.

* هێزی ئاسایی، توانا و هێزەکانی سوپای تێداکۆکراوەتەوە، ئەم هێزە دەبێت لە پێشەوە دوژمن بوەستێنێت و ئینجا هێزی تایبەت کە زۆربەی کات دوژمن چاوەڕوانی نیە و خاڵێکی بەهێزەکەی زۆر باشە، ئەبێت لە پاڵەکانەوە هێرش بکات.

* دوژمن لە بەرەنگاری جەنگاوەرەکاندا ئەبێت وەکو بەرەنگاربوونەوەی هێلکە و ئاسیاو بێتە بەرچاو، وەکو ئەو قسەی پێشینیانەکە گوتویانە: "**بەهێزترین بەشی سوپا ئەبێت هێرش بکاتە لاوازترین بەشی دوژمن**".

* بەگشتی لە جەنگێکدا، هێزی ئاسایی بۆ لێدانی سەرەکی دوژمن و هێزی تایبەتیش بۆ خولقاندنی سەرکەوتنی کۆتایی بەکارئەهێنرێن.

* بەکارهێنانی هێزی تایبەت و تێکەڵکردنیان لەگەڵ هێزەکانی سروشت، بە هەزاران پلانی جۆراوجۆر دەکرێت. ئەوان وەکو ئەلف و بێی موسیقا بە هەزاران شێوازی جیاواز ئەتوانن لە لای یەکدا بچنرێن.

* هاوسازی و هاوسەنگی بەکارهێنانی هێزەکانی ئاسایی و تایبەت ئەبێت وەکو ئەڵقەکانی فەنەر پێچاوپێچ بێت تا کەسێک نەتوانێت بە ئاسانی بزانێت ئەڵقەیەک لەکوێدا دەستپێدەکات و لەکوێدا کۆتایی پێدێت.

ئەگەر ئاو ئەتوانێت تاشەبەرد بهاوێژێت، لەبەر تەوژم و خێرایی سەنگییەتی.

When torrential water tosses boulder,

it is because of its momentum.

ئەگەر هەڵۆ ئەتوانێت بە هێرشێک ڕاوەکەی تێکبشکێنێت،

لەبەر کات زانییەتی.

When the strike of a hawk breaks the body of its prey,

it is because of timing.

*کەواتە، هێرشی فەرماندەیەکی جەنگیکەر زۆر ڕێک و پێک و تێکشکێنەری هەموو بەرەنگارییەکە.

* هێزی سوپایەکی جەنگیکەر زۆر لە تیروکەوان ئەچێت، ئەبێت لە پێشدا باش کەوانەکە بکێشیت و بیچەمێنیتەوە تا وزەیەکی زۆر بداتە تیرەکە ئینجا لە کاتێکی گونجاودا بەری بدەی.

* لە جەنگدا، هەموو شتێک ناڕێک و پێک و بێ نەزم دەرئەکەوێت، بەڵام ئەو شتەی ئەم ڕووبارە سامناکە ئاڕاستە ئەکات هەمان ئاڵا و دەنگی تەپڵ و دەهۆڵەکانە کە وەکو زمانێکی تایبەت فەرمانەکان ئەگەیەنێت.

* بەس فەرماندەیەکی ڕێک و پێک توانای ئەوەی تێدایە سوپاکەی بە نارێک و پێک بنوێنێت بۆ ئەوەی دوژمنەکەی فریو بدات. فەرماندەیەک بە درۆوە خۆی ترسنۆک پیشان ئەدات، زۆر ئازایە کەسێک زۆر بەهێزە کە بتوانێت لەکاتی پێویستدا، بەدرۆوە خۆی لاواز بنوێنێت.

* ڕێک و پێکی پەیوەستە بە ڕێکخستنەوە. ئازایەتی و ترسنۆکی پەیوەستن بە بارودۆخەوە، توانایی و لاوازی پەیوەستن بە پێکهاتەوە. واتەکاتێک جەنگە نە شوێن و بارودۆخی مەبەست، تەنانەت ترسنۆکەکانیش، ئازا ئەبن و ئەگەر شوێن و بارودۆخی مەبەستتان دۆڕاند، ئازاکانیش ترسنۆک ئەبن. لەبەر ئەوەی ئەم بار و حاڵەتانە بەس بە بارودۆخەوە پەیوەستن.

فەرماندەیەکی لێزان لە ناودڵی بارودۆخدا بە شوێنی سەرکەوتنەو لە ژێردەستەکانی داوای ناکات.

A skilled commander seeks victory from the situation and does not demand it of his/her subordinators.

* فەرماندە بەس ئەتوانێت کەسانی شیاو هەڵبژێرێت و ئەوانیش کەڵک وەرگرتن لەدەرفەتەکو نجاوەکان ئەگرنە مل.

* جەنگاوەرەکان ئەکرێنە سێ بەشەوە: ئەوانەی ئازان ئەبێت بۆ هێرش بەکاربهێنرێن، ئەوانەی وریان ئەبێت بۆ بەرگری بەکاربهێنرێن، ئەوانەیش ژیرترن وەکو ڕاوێژکاردابنرێن.

* بەکورتی، جەنگاوەرەکان وەکو تلەبەردی لەسووڕانەوەدان کە دەبێت لەکاتیگونجاودا و ڕێک بۆ ناودڵی دوژمن بەربدرێن وکتوپڕ لێیان بدەن، هەر چەندیش هێرش ئەڵەکتراوتر بێت، سەرکەوتنەکوتەرتر و بەدڵنیاییەکی زۆرترەوە دێتەدی.

* بەگشتی سوپایەک زووتر شوێنی نەبەرد بگرێت، تواناو ئامادەیی زۆرتری تێدایە بۆ نەبەرد و ئەو سوپایەیشکە درەنگتر دەگات، زۆر ماندووترە. هەر بۆیە جەنگاوەرێکی لێزان ئەزانێت چۆن دوژمن ڕابکێشێت بۆ شوێنی سوپاکەی خۆی و هیچکاتێکیش ناهێڵێت دوژمن ئەمکارەی پێبکات.

کەسێک ئەیەوێت ملی دوژمنەکەی بابدات بکاری مەبەستی خۆی پێبکات،

هەندێک قازانج ئەخاتە بەردەستی.

One able to make the enemy come of his own accord,

does so by offering him some advantages.

* ئەگەر بتوانن شوێنە هەستیارەکان، لە ڕێگا ستراتیجییەکاندا بگیرێن، ئیتر دوژمن ناتوانێت بۆ پێشەوە بێت.

کاتێک پشیلەیەک لە بەرکونی مشکەکاندا بێت، دە هەزار مشکیش بن زات نەکەن بێنە دەرەوە.

When a cat is at the rat hole,

ten thousand rats dare not to come.

*کاتێک دوژمن خەریکی حەسانەوەیە، ماندووی بکە کاتێک تێرە، برسی بکە کاتێکیش ناجوڵێتەوە و ڕاوەستاوە، پاڵی بنە و بیجوڵێنەوە.

* بۆ جێگەیەک بڕۆ دوژمن بەپەلە بۆی دەڕوات گورج و تیژ خۆت بگەیەنە شوێنێک دوژمن چاوەڕوان نییە لەوێدا بێت.

* ئەگەر گورج بڕۆی بۆ ئەو شوێنەی دوژمن لەوێ نیە، هەزاران کیلۆمەتر پێش دەچیت بێ ئەوەی خۆت ماندوو بکەی.

* بڕۆ بۆ شوێنێک هیچ جۆرە دوژمنێکی لێ نییە لە سووچێکی نوێوە هێرش بکەرە سەری.

* دوژمن لە بەرەنگاری جەنگاوەرە لێزانەکاندا نازانێت خۆی لەکوێوە بتەوکاتەوە و تەنانەت نازانێت بۆکوێ هێرش بکات.

* ئەگەر من بتوانم ڕێوشوێنی جەنگی دوژمن بناسم و لە لایەکی دیکەیشەوە، ڕێوشوێنی جەنگی خۆم بشارمەوە، بە کردەوە هێزی خۆم چڕ و هێزی دوژمنم پەرشوبڵاوکردووە و بەم کارە ئەتوانم دوژمنەکەم زۆر لاوازبکەم و بیخەمە بارودۆخێکی خراپەوە.

* هەندێک جار گرووپی بچووک لە سوارە بەهێزەکانم بۆ هێرش بۆ ناوچەی ئامادەنەکراوی دوژمن بەکاردێنم. هەندێک جاریش چەند کەواندار دەنێرمە لاپاڵەکان تا لای ڕاست و چەپەوە بژلێژێنن. دەنگی شەیپوورەکان لە ڕاست و چەپەوە دەر ئەکەم و لە پشتەوە هێرش ئەبەمە سەری و بە دەنگی تەپڵ و هێمای بێ مانا دڵەڕاوکێی بۆ دروست دەکەم و توانای بڕیاردانی فەلەج ئەکەم.

* ئەگەر دوژمن خۆی لە بەرامبەرەوە ئامادە بکات بۆ جەنگ، لە پشتەوە لاوازدەبێت و ئەگەریش لە پشتەوە خۆی بەهێز بکاتەوە لە بەرامبەرەوە شکست دێنێت. ئەگەر لاپاڵی چەپ بتەوبکات، لاپاڵی ڕاستەوەی شکست باری زۆرتر دەبێت و ئەگەریش لاپاڵی ڕاست بەهێزبکات، هێزێکی کەمی لە لاپاڵی چەپ دەمێنێتەوە.

* فەرماندەی بەئەزموون هیچ سەروشوێنێک لە خۆی جێ ناهێڵێت وەکو عارفەکان، بێ دەنگ و نهێنی سنوورەکانی دەنگ، وێنە، شوێن وکات تێدەپەڕێنێت و ئاوەها چارەنووسی دوژمنەکەی دیاری ئەکات.

* خاڵی بەهێزیت لای دوژمنەکەت ئەبێت وا دەرکەوێت دەڵێی خاڵی لاوازی تۆیە، خاڵی لاوازیتیش ئەبێت وەکو خاڵی بەهێزی دەرکەوێت.

کاتێک دوژمن خۆی لە هەموو شوێنێکدا ئامادە بکات،

لە هەموو شوێنێکدا لاوازدەبێت!

When he prepares everywhere,

he will be weak everywhere!

* فەرماندەیەک جەنگاوەری کەمتری هەیە، دەبێت بچێتە داڵەتی بەرگری و شوێنی خۆی بە پێی جۆری ئۆپەراسیۆنی جەنگی دوژمنەکەی بتەوێکاتەوە. فەرماندەیەکیش جەنگاوەری زۆرتری هەیە دەبێت بچێتە داڵەتی هێرشەوەو نەهێڵێت دوژمن پلانە جەنگییەکەی بناسێت.

* فەرماندەی لێزان، باش دەزانێت جەنگەکەی و لەکوێدا دەستپێبکات و ستونەکانی جەنگی خۆی لە پێشترەوە بۆ یەکدادان ئەچنێت و لەکاتی دیاریکراویشدا ئەیانێرێت بۆ شوێنی نەبەرد.

* سۆن تزوو دەڵێت: من لەو باوەڕەدام ئەگەر دوژمن لە بارودۆخێکی زۆر باشتردا بوو، ئەتوانین لە جەنگ دووری بخەینەوە تا بە تێپەڕبوونی کات و بەدەستهێنانی توانای پێویست، بتوانین سەرکەوین بە سەریدا. پێشینیان لە سەر ئەم بابەتە گوتویانە: ئەگەر چی دوژمن زۆر زۆرتر و بەهێزتریش بێت، ئەگەر لە شوێنی سوپاکەم ئاگادار نەبێت، من دەتوانم بەردەوام سەرقاڵی ئامادەکاری جەم وکاتی پلاندانانی جەنگی بۆ نەهێڵمەوە.

*کەواتە دەبێت نەخشە و پلانەکانی دوژمن دەر بخەین، ئینجا ئەتوانین بزانین کام ستراتیجی سەرکەوتوو وکام ستراتیجیش شکست خواردوو دەبێت.

*دوژمن سەرلێشێواو بکە تاکو پلانی جەنگییەکەی دەرکەوێ بۆت.

* پلانی جەنگی دوژمنەکەت بناسە تا شوێنی جەنگ دیاری بکەیت.

* سەبارەت بە دوژمنەکەت زانیاری کۆبکەوە تا بزانیت توانای لەکوێدا زۆر و لەکوێدا کەمە.

* باشترین پلانی جەنگی، پلانێکە هەمیشە بە یەک شێوازی دیاریکراو نەبێت کە ئاوەها بوو، باشترین و ڕێکخراوترین سیخوڕەکانی دوژمنیش ناتوانن دژ بە تۆ پلان دابڕێژن.

*کەواتە هەرکات من سەرکەوتنم بە دەست هێنا، ئیتر تاکتیکەکەم دووبارە ناکەمەوە، بەڵکو بۆ بارودۆخە جیاوازەکان، بەرپەرچدانەوەی جیاواز دەگرمە بەر.

* سۆن تزوو دەڵێت: سوپا ئەبێت وەکو ئاو بێت. ئاو خۆی لە بەرزایی دوور ئەگرێت و ئەڕژێتە شوێنی نزم. سوپایش پێک دەبێت وا بێت، لە خاڵە بەهێزەکانی دوژمن خۆی دوور بگرێت و هێرش بەرێت بۆ خاڵە لاوازەکانی. هەر بەو جۆرەی ئاو جووڵەی خۆی بە پێی بەرزی و نزمی زەوی دەگۆڕێت، سوپایش ئەبێت پلانی جەنگی خۆی بە پێی بارودۆخ و جۆری بەرەی جەنگ دابڕێژێتەوە. هەر بەو جۆرەی ئاو شێوازێکی یەکسان و دیاریکراوی نییە، لە جەنگیش دا هیچ بارودۆخێکی یەکسان و هاوتا بوونی نیە و سوپایش ئەبێت خۆی بە باشترین شێوە لەگەڵ بارودۆخەکان بگونجێنێت.

* بەگشتی لەکاتی پێکهێنانی سوپادا، سەرەتا فەرماندە فەرمانی ڕابەر یا خود سەرکردە وەردەگرێت و پاشان خەڵکەکۆ دەکاتەوەو پاش ئۆردو لێدان، جەنگاوەرەکان فێردەکات و ڕێکیان دەخات و یاسا و تەمێی پێویست دیاری دەکات.

* هیچ شتێک ئەوەندەی هونەری ڕێکخستنی ئۆپەراسیۆنی جەنگی ئەستەم نیە، سەختی ئەمکارە لەوەدایەکە ئەبێت ڕێگایەکی پێچاوپێچ بکەیتە ڕێگایەکی ڕێک و ڕاستەوخۆ و نەهامەتیش بکەیتە قازانج و سوود.

*کەواتە سوپا لە ڕێگایەک غەیری لە ڕێگای ڕاستەوخۆوە بەرەو دوژمن ببە و دوژمنەکەتیش بە بەکارهێنانی فێڵێک لە ڕێگای خۆی لادە. بەمکارانە ئەتوانیت درەنگتر ڕێپێوان دەستپێبکەیت و زووتریش بگەیتە شوێنی نەبەرد.

* مەترسی و دوو بەختەکی لە ناخی هەر ئۆپەراسیۆنێکی جەنگیدایە. جەنگاوەرە ڕاستەقینەکان قازانجی لێ وەردەگرن کەسانی تریش بەس تووشی مەترسی دەبن.

* ئەگەر بەس بەرژەوەندی هاندەری سوپایەک بێت، بەدڵنیاییەوە ئەو سوپایە سەرنەکەوێت.

* سوپایەکە خاو، قورس و پڕئەژمار بە ڕێ ئەکەوێت، شکست دێنێت.

* ئەگەر لە ئۆپەراسیۆنێکدا بەس خێرایی جموجوڵ گرنگ بوو، باشترە یەک لەسەر دەی (١٠٪) ئەو جەنگاوەرانەی توانای زۆرتریان تێدایە هەڵبژێردرێن بۆ ئەوەی هێرش دەستپێبکەن و بێ وەستان، بەردەوام و بە شەو و بە ڕۆژ، بەرەو دوژمن پێش بچن و ئەوانی تریش بە پێی پلەی توانەکەیان بە ڕێبکرێن بەڵام کاتی حەسانەوەی زۆرتریان بۆدابنرێت. کە ئاوەهاتان کرد، کاتێک ١٠٪ی پێشەوە ماندوو بوون هێزی بە وزە دەگاتە بەرەوە و ئەمانە وەها پێکەوە دەبەسترێنەوە دەڵێی ڕووبارێکە هەر ناوەستێنەوە و لە کۆتاییشدا دوژمن لە ناو ئەدەن.

* فەرماندەیەک لەکاتی ڕێپێواندا لە یارمەتی ڕاوێژکار و ڕێنوێنی پسپۆڕەکان وەرنەگرێت، ناگاتە ئامانجەکانی خۆی.

* بنەمای جەنگ، بەکارهێنانی گزی و فڕ و فێڵە.

* لەکاتی پێویست وەکو نجاودا بجوڵێن و لەکاتێکیشدا بارودۆخ لە قازانجتان نیە، لە جێگەی بڵاوکردن و پاشان کۆکردنەوەی دووبارەی هێزەکانتان، لەوانەیە بتوانن بارودۆخی نالەبار بگۆڕن و هەلێکی نوێ بڕەخسێنن.

* سۆن تزوو دەڵێت: لەکاتی بەشداریکردن لە زنجیرەیەک ئۆپەراسیۆنی جەنگیدا، وەکو با خێرا بجوڵێن، لە پێشڕەویدا وەکو دارستان، پڕ وزە و شکۆمەند بن، لە تاڵانکردندا وەکو ئاگر، لە بەرگری و خۆگریدا وەکو کێو، و لە قووڵیدا وەکو هەور، و لە لێدانیشدا وەکو هەورە تریشقە بن.

* بۆگرتنی تاڵانی جەنگی هێزەکان بڵاوکەنەوە لەگوند ودەوروپشت، بەڵام پاش هەڵگیرکردنی ناوچەکە تاڵانەکان دابەشکەن.

بارودۆخ هەڵسەنگێنە، پاشان بجوڵێ!

Weight the situation, then move!

* ئەوکەسەی هەر دوو شێوازی هێرشی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، وە هەروەها ئۆپەراسیۆنی جەنگی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ ئەزانێت، سەرکەوتوودەبێت.

* پێش هێرشکردن ڕێگا و شێوازی پەیوەندیکردن بە هێزەکانتان لەکاتی نەبەردا، دیاریکەن.

* لەکاتی هێرشدا، فەرمانەکان ئەبێت ستاندەر و نەگۆڕ بن تا سەر لە جەنگاوەرەکان نەشێوێنن.

* ئەوانەی بە بیستنی فەرمانی هێرش، هێرش نەکەن و بە بیستنی فەرمانی پاشەکشە، پاشەکشە نەکەن، ئەبێت ملیان بپەڕێنن و بیانکوژن.

*کەواتە کەسێک پسپۆڕ بێت لەکۆنترۆڵکردنی ڕەفتاری دوژمن دا، سەرەتادا دوژمن داماوەکات و پاشان هێرشی بۆ ئەبات. ئەودوژمن تووڕەدەکات تا بیر و هۆشی پەرتەوازەکات و بەردەوام هێرشی بۆ ئەبات تاکو تووشی ترسیکات و توانای داڕێژانی پلان و ئۆپەراسیۆنی لێ بسێنێت.

* هەموو بەیانیان دوژمن ورەی باشە و وردە وردە دائەتەپێت و سست ئەبێتەوە، لە شەویشدا زۆرتر لە هەر کاتێک بیری ماڵەوەی ئەکات و ورەی خراپ ئەبێت.

* کەواتە کەسانی بەئەزموون و لێزان لە جەنگاوەریدا کاتێک بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمن هەڵئەبژێرن کە ورەی زۆر بەرز و ئامادەی جەنگییە. ئەم هونەرە، هونەری کۆنترۆڵکردنی فاکتەری ورەیە.

* سوپای باشتر سوپایەکە لە ڕێکوپێکی تەواودا و هێمن و هێور، چاوەڕوانی سوپایەکی ناڕێکوپێک و پڕ شات و شوتە. ئەم هونەرە، هونەری کۆنترۆڵکردنی فاکتەری زەینە.

* بە سوپایەکی نزیک لە بەرەکانی جەنگ وا چاوەڕوانی گەیشتنی دوژمنە، بە سوپایەکی پڕ وزە وا لە بەرامبەری سوپایەکی ماندوو ڕائەوەستێت و بە سوپایەکی تێر وا بەرامبەری سوپایەکی برسی ئەبێتەوە، فاکتەری هێزی جەستەیی جەنگاوەرەکانیش دەوری خۆی ئەبینێت.

* دوژمن لەگەڵ سوپایەک ڕێگای پەیوەندی ڕێکوپێک یا خود ستوونەکانی زۆر بە باشی ڕێکخراون بەشەڕ نایەت. لەم کاتانەدا بارودۆخی نوێ دێنە ئاراوە. ئەم هونەرە، هونەری گۆڕینی بارودۆخە.

* کاتێک دوژمن شوێنێکی ستراتیجی گیرکردووە خۆتان لە بەرەنگاربوونەوەی دوور بگرن.

* لە شوێنکەوتن و ڕاونانی دوژمنێکی بەهێز وا بە درۆ خۆی بە هەڵهاتوو ئەنوێنێت خۆتان دوور بگرن.

* هێرش مەکەنە سەر هێز و سەربازە تایبەتەکانی دوژمن.

* فریوی دانە و تەڵەکەی دوژمن مەخۆن، ماسی کە تەڵەکەی خوارد ڕاو ئەکرێت.

* کاتێک دوژمن بەرەو ماڵەوە دەڕوات پێشی پێ مەگرن، ئەو بۆ گەیشتن بە ماڵی خۆی ئێوە و هەر کۆسپێکی گەورەی دیکەیش لە پێش هەڵئەکەنێت.

* بۆ دوژمنێک دراوەتە گەمارۆوە، ڕێگایەکی هەڵهاتن جێبهێڵنەوە، بەم کارە ئەو هەست ئەکات ڕێگایەکی تر جگە لە مردن هەیە.

دوژمن لە سووچێکدا مەخەنە گەمارۆوە،

چونکە ئەگەر بزانێت هیچ ڕێگایەکی جگە لە مردن نییە،

تادوا هەناسە و بە تەواوی هێز و توانایەوە بەرەنگاری دەکات.

Don’t surround the enemy at corner;

if they know there is no alternative,

they will fight to the death.

* بەگشتی، بۆ وەرگرتنی جەنگاوەر لە سەرەتادا فەرماندە فەرمانی حکومەت وەرئەگرێت و خەڵک بۆ پێکهێنانی سوپا ئەجوڵێنێت.

١ ) بۆ پێکهێنانی سوپا لە زەوییە نزمەکاندا ئۆردو لێ مەدەن.

٢ ) لە زەوییەکانی دور لە ناوەندا، لەگەڵ سەرکردەکانی دراوسێ هاوپەیمانێتی بکەن.

٣ ) لە ناوچەی وشک و بێ بەر و بێ دانیشتوان، دوودڵی مەکەن و مەوەستن.

٤ ) ئەگەر پێویستی کرد لە ناوچەیەکی داخراودا ئۆردو لێ بدەن، دەبێت سەرچاوەکان ئەوەندەی پێداویستییەکان لە بەردەستدا بن.

٥ کاتێک ڕێگای هەڵهاتنت بۆ نیە، تادوا هەناسە شەڕبکە.

٦ ) ڕێگەگەلێک هەیە نابێت پێیدا بچن، دوژمنانێک هیە نابێت بکوتنە سەریان، شارگەلێک هەیە نابێت هێرشیان بۆ بکەن، زەوگەلێک هەیە نابێت لەسەریان ململانێ بکەن.

٧ ) هەندێک بارودۆخ هەیە پێویست ناکات فەرمانی حکومەت جێبەجێ بکرێن.

٨ کە ڕێگایەکی دروست و بە تەواوەتی ژیرانەت بینی،

بیکە و چاوەڕێی فەرمان مەبە!

When you see the correct course,

act! , do not wait for orders!

٩ گۆڕاوی نۆیەم بریتیە لە بەکارهێنانی فەرماندەیەک هەموو نۆگۆڕاوەکان دەناسێت و ئەزانێت چۆن جەنگاوەرەکان بەکاربهێنێت.

* فەرماندەیەکی بەهێز، هەمیشە دوژمن سەرقاڵ ئەکات و بە پێشکەشکردنی قازانجی درۆیەکە، دڵخۆش و سەرقاڵی ئەکات.

* یەکێک لە بنەماکانی جەنگ ئەوەیە هیچکاتێک وامەزانن دوژمن نایەت، بەڵکو هەمیشە ئامادەی هاتنی بن!

ئەگەری هەیە پێنج تایبەتمەندی مەترسیدار لە کەسایەتی فەرماندەیەکدا بن:

١ ) ئەگەر فەرماندەیەک کێمبەک و نەترس بێت، لەوانەیە بکوژرێت. پێشینیان گوتویانە: فەرماندەیەکی ئەحمەق و بێ باک لە بەرەکانی جەنگدا کارەسات دروست ئەکات.

٢ ) ئەگەر ترسنۆک بێت، شکست دێنێت. ئەوەی گیان خۆشەویست بێت و بایەخی زۆر بداتە گیانی خۆی گیرۆدەی دوودڵی و گومان ئەبێت.

٣ ) ئەگەر فەرماندەیەک کەچ خولق و قۆشمە و ڕاڕایی بێت، زوو ئەحمەق ئەبێت. نەگۆڕی ڕەفتار، یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی هەرە پێویستە بۆ فەرماندە.

٤ ) ئەگەر لە ڕادە بەدەر بیر لە ئابڕووی خۆی بکاتەوە، ئەتوانن بوختانی بۆ بکەن وەکە وای لێ هات بیری بەس لای ئەو بوختانە ئەبێت و ناتوانێت باش بیر بکاتەوە و هەر لە بەر ئەمەش تووشی هەڵە ئەبێت.

٥ ) ئەو کەسەی ناخێکی میهرەبانی هەیە، بە ئاسانی و بە هێرشی بەردەوام هیلاک و وەڕەز ئەبێت.

ڕووخانی سوپا و مەرگی فەرماندە، لە بەر بێ ئاگایی لەم خاڵانەی سەرەوەیە و ئەبێت زۆر بە باشی بیر لەم خاڵانە بکرێتەوە.

*کاتێک ئەتانەوێت ناوچەیەک داگیر بکەن و بەرەنگاری دوژمن ببنەوە، لەکێوەکان تێپەڕبن و لە شوێنێکی بەرزدا، باشتر وایە لە پاڵداوێنی ڕۆژهەڵاتی کێوەکاندا جێ بگرن.

* بەرەو نزمایی و لای خوارەوە هێرش بکەن و قەت بەرەو بەرزایی لای سەرەوە هێرش مەبەن.

* ناوچە بەرزەکان، شوێنێکی باشترن بۆ دانانی ئۆردوگای سوپا.

کاتێک نێردراوەکانی دوژمن بە نەرم و نیانی قسە ئەکەن، بەڵام هەر خەریکی ئامادەکارین، بە زوویی هێرش دەکەنە سەرتان.

*کاتێک دوژمن ڕەفتار و قسەی خەڵەتێنەرە و زۆر ئەستەم بۆ پێشەوە دێت، بە دڵنیاییەوە پاشەکشە دەکات.

*کاتێک ئاهەنگی قسەی دوژمن بۆ داوای لێبوردن کردنە، ئەوا بزانە پێویستی بە کات هەیە بۆ ئەوەی بگاتە ئاستی ئامادەیی پێویست.

*کاتێک دوژمن لە ناکاودا داوای ئاگربەستێکاتی ئەکات، سەرقاڵی پلان داڕێژانی جەنگییە.

*کاتێک گالیسکەکانی لە پێشەوە دادەنێت و هێزی پیادە لە لاپاڵەکانەوە جێگیرکراون، دوژمن لە حاڵەتی جەنگیدایە.

*کاتێک بە خێرایی جموجوڵ ئەکات، لەوانەیە مەبەستی ئەوە بێت بگاتە شوێنی گەیشتن بە هێزی یارمەتیدەری خۆی.

*کاتێک نیوەی سوپای دوژمن بەرەو پێشەوە دێن و نیوەکەیان ئەوەستن، دوژمن بە تەمایە فریوتان بدات.

*کاتێک جەنگاوەرەکانی دوژمن پاڵیان داوەتە چەکەکانیانەوە، ئەوا دیارە لە جەنگ بێزار بوونە.

*کاتێک دوژمن هەلێکی گونجاو یاخود بارودۆخێکی پڕسوودی بۆ ڕەخساوە و پێی نەگات، لەوانەیە زۆر هیلاک بوو بێت.

*کاتێک باڵندەکان لە سەری ئۆردوگایەکدا ئەفڕن، دیارە ئەو ئۆردوگایە کەسی تێدا نییە یاخود ئەو بینا و تفاقانە درۆیەکەن و بۆ فریودان دروستکراون.

*کاتێک لە شەودا ئۆردوی دوژمن پڕ لە قاڵە قاڵە، ئەوا بزانە دوژمن ترساوە.

*کاتێک جەنگاوەرەکانی دوژمن ناڕێکوپێکن، ئەوا بزانە فەرماندەکەیان کەسێکی ناشارەزا و نەزانە.

*کاتێک پەیوەندیکردن پێکەوە لە نێوان پلە جیاوازەکانی سوپای دوژمندا زۆر بوو، ئەوا بزانە ئەو ناڕێکوپێکە.

* ئەگەر ئەفسەرەکانی دوژمن سەرگوڕنی و تووڕەیی دەکەن، بزانە دوژمن هیلاکە.

*کاتێک جەنگاوەرەکان لەگروپی بچوک بچوکدا هەر خەریکی قسەکردن و هاتوچۆن و پەکە پەکیانە ئەوا بزانە فەرماندە و جەنگاوەرەکان بێ متمانەن بە یەکتری.

* پاداشکردنی بەردەوام پیشاندەری ئەوەیە سەرچاوەکانی سوپا ڕوو لە تەواوبوونە و تەمێکردنی بەردەوامیش پیشاندەری ئەوەیە سوپای دوژمن لە تەنگانە و ناخۆشییەکی زۆر خراپدایە.

*کاتێک سەربازەکانی دوژمن، بە ورەی بەرزەوە بۆ ماوەیەکی درێژ لە بەرامبەرتدا ڕاوەستاون و نە جەنگ دەستپێدەکەن و نە بەرەکانی جەنگیش بەجێدێڵن، زۆر ئاگادار بن و بارودۆخەکە زۆر بە باشی هەڵسەنگێنن.

*کاری شیاو ئەوەیە بارودۆخی دوژمن بە باشی هەڵسەنگێنن و لە هەمانکاتدا لە سەر هێزەکانی خۆتان چڕببنەوە تاکو زاڵ بن بە سەریدا.

ئەوکەسەی دوورئەندێشی پێویستی تێدا نیە ودوژمن بە وردی هەڵناسەنگێنێت،

بەدڵنیاییەوە ئەکەوێتە داوی دوژمنەکەیەوە.

He who lacks foresight and underestimate his enemy,

will surely be captured by him.

* ئەگەر پێش ئەوەی لە وەفاداری جەنگاوەرەکان دڵنیاببیتەوە تەمێیان بکەی، نافەرمان دەبن و چیدی ناتوانیت بیانگریتەکار. ئەگەر جەنگاوەرەکان وەفادارن بن بەڵام تەمێکاری کاریگەرییان لە سەریان نەبێت، دیسان ناتوانیت بیانگریتەکار.

*کەواتە بە ڕەوشتەوە فەرمانیان پێبکە و پڕیان بکە لە هەستی نیشتمان پەروەری، گوڕ و تین و ڤینی سەربازی، ئەگەر ئەم کارانەت کرد بە دڵنیاییەوە سەرکەوتن بۆ تۆیە.

* ئەگەر لە کاتی فێرکردنی جەنگاوەرەکاندا، فەرمانەکانتان بەردەوام کاریگەر و دروست بن، ئەوا گوێ ڕایەڵ ئەکەن، ئەگەر نا، جەنگاوەری نافەرمان پەروەردە ئەکرێن.

* ئەگەر فەرمانەکان بەردەوام لە سەر متمانە و هەلوکات لە ژێر چاودێریدا بن، پەیوەندییەکی دڵخۆشکەر و شیاو لە نێوان فەرماندە و جەنگاوەرەکانیدا دروست ئەبێت.

زەوییەکان بە چەند شێوەن :

١ ) شێوەیەک هەیە کە ئێمە و دوژمن وەکو یەک و بە ئاسانییەوە ئەتوانین بیپێوین. لە ئاوەها زەوییەکدا ئەو کەسەی شوێنە ڕوناک و بەرزەکە ئەگرێت، بە جۆرێکە ڕێگای تفاقیشی هەر لە ئەوێوە تێپەڕێت، لە جەنگدا قازانج ئەکات.

٢ ) شێوەیەک زەوی هەیە کە ڕزگاربوون لێیان ئاسانە بەڵام گەڕانەوە بۆیان زۆر ئەستەمە. لە ئاوەها زەوییەکدا ئەگەر دوژمن ئامادە نەبێت و ئێوە کتوپڕ هێرشی بۆ بکەن و بێنە دەرەوە لەوانەیە شکستی پێ بێنن. ئەگەریش دوژمن ئامادە بوو و ئێوە ڕۆیشتن و نەبەردتان کرد بەڵام سەرکەوتنتان بەدەست نەهێنا، ئیتر گەڕانەوەتان ئەستەمە و بەسوودیش نییە.

٣ ) شێوەیەک زەوی هەیە هیچ قازانجێکی بۆ هیچکام لە دوو لایەنی جەنگ نییە و هەر داوێکیش لەوێدا دابنرێت هیچ ئەنجامێکی نییە. لە ئاوەها زەوییەکدا خۆتان وا بنوێنن کە خەریکن هەڵدێن و شوێنەکە بەجێدێڵن کاتێک نیوەی هێزەکەی دوژمن لەو شوێنە هاتە دەرەوە، هێرش بکەنە سەریان و لە جەنگ بەرامبەریاندا سەرکەوتووانە نەبەرد بکەن.

٤ ) شێوەیەک زەوی هەیە تەسک و تەنگەبەرە، ئەگەر توانیتان زووتر ئەم جۆرە زەوییانە داگیر بکەن، ڕێگای هاتووچۆ دا بخەن و چاوەڕێی دوژمن بکەن. ئەگەریش دوژمن زووتر ئەو شوێنانەی داگیر کرد، بە شوێنیدا مەڕۆن، ئەگەریش ئەو ڕێگەکەی بە تەواوەتی دانە خستبوو، لەوانەیە بتوانن ئەوی داگیر بکەن.

٥ ) ئەگەر زەوی لێژ بوو لە بەرزایی بەر خۆرەتاودا سوپاکەتان جێگیر بکەن. ئەگەر دوژمن زووتر ئەو شوێنانەی داگیر کرد وا بنوێنن خەریکن ئەوێ بەجێدێڵن و ئاوەها فریوی بدەن تاکو شوێنەکەیان جێ بهێڵن.

٦ ) ئەگەر شوێنی نەبەرد دوور و هێزەکان لەگەڵ هێزی دوژمندا بەرامبەر بوو، نەبەرد کردن بێ سوودە. نابێتیش لە شوێنێکدا دوژمن پێشتر داگیری کردووە و خۆی جێگیر کردووە نەبەرد بکرێت.

ئەم شەش بنەمایە، شێوە و ڕوخساری ئەو زەوییانەی پیشان دەداتکە لەوانەیە جەنگی تێدا بکەین. گەورەترین بەرپرسیارێتی هەر فەرماندەیەک ئەوەیە لەم جۆرە زەوییانەدا بە وریایی و وردی و سەرنجەوە بڕیار بدات و کار بکات.

* هەڵهاتنی سەربازەکان لە بەرەکانی جەنگ، نافەرمانی، ناڕێکوپێکی و سەرلێشێواوی و هۆکارە سروشتییەکان، هیچ کامیان پەیوەندی بە شێوە و ڕوخساری زەوی و جۆری بەرەکانی جەنگەوە نییە و بەس لە بەر هەڵەی فەرماندەیە.

*کاتێک ئەفسەرەکان شیاو و جەنگاوەرەکان نەشیاو بن، سوپا تووشی ئاژاوە و سەرلێشێواوی دەبێت.

کاتێک جەنگاوەرەکان توانا و ئەفسەرەکان ناتوان بن، سوپا نافەرمان دەبێت.

When troops are strong and officers weak,

the army is insubordinate.

*کاتێک ئەفسەری باڵادەست توڕە و نافەرمانەو لەکاتی نەبەردا بە بێ فەرمانی فەرماندەکەی، خۆی دەکاتە ناو دڵی پێکدادانەکەدا ئەویش بێ ئەوەی بزانێت ئەبێت چی بکات، ئەوا سوپا خێرا دەڕمێت.

*کاتێک فەرماندەیەک لاواز بێت و دیسیپلین و ڕژێم و ڕێکخستنێکی بەهێزی نەبێت و ڕێنوێنی و فەرمانەکانی ڕوون و ئاشکرا نەبن و بەردەوام ئەفسەرەکان ڕێنوێنی دەکات، ئەتوانین بڵێین ئەو سوپایە ناڕێکوپێکە.

*کاتێک فەرماندە نەتوانێت دوژمنەکەی هەڵسەنگێنێت، هێزی بچوک بۆ بەرەنگاری هێزی گەورە و هێزی گەورەیش بۆ بەرەنگاری هێزی بچوک بەکاردێنێت، ئەنجامەکەی شتێک نیە جگە لە ناڕێکوپێکی و ئاژاوە.

دوژمنەکەت بناسیت و خۆت بناسیت، سەرکەوتنت ئەبەد نەکەوێتە مەترسییەوە.

بارودۆخی زەوی و کەش و هەوایش بزانە و سەرکەوتنت هەمەلایەنە دەبێت.

Know the enemy, know yourself;

your victory will never be endangered.

Know the ground, know the weather;

your victory will then be total.

بۆ بەکارهێنانی جەنگاوەرەکان ئەبێت نۆ جۆری مەیدانی جەنگ بناسین:

١ ) مەیدانی بەربڵاو: کاتێک خانێکی دەرەبەگ لە زەوییەکانی خۆیدا جەنگ دەکات، لە مەیدانی بەربڵاودایە. لەم جۆرە مەیدانەدا ئەفسەر و سەربازەکان حەز ئەکەن سەردانی ماڵەوە بکەن.

٢ ) مەیدانی سنوری: ئەگەر لە جەنگدا کەمێک بچیتە ناو خاکی دوژمنەوە،مەیدانی جەنگ لە جۆری مەیدانی سنورییە.

٣ ) مەیدانی ستراتیجی: ئەگەر جەنگ لە زەوییەکدا بۆ هەردوو لایەن وەکو یەک بەسوود بێت، مەیدانی جەنگی ستراتیجی دروست بووە.

٤ ) مەیدانی پەیوەندی گەیێن: ئەم جۆرە مەیدانە بۆ هەردوو لا وەکو یەک لە بەردەستدایە. ئەم جۆرە مەیدانە تەخت و فراوانە و هەردوو لایەن ئەتوانن هاتووچۆی بکەن یا خود سەربازگەی تێدا دروست بکەن.

٥ ) مەیدانی چەق: کاتێک ویلایەتێک لە لایەن سێ ویلایەتی ترەوە پەرژین دراوە، هەرکام لەو سێ ویلایەتە بتوانێت پێشتر لەوانی تر چەقی ویلایەتی پەرژین دراو کۆنترۆڵ بکات، دەوروپشتەکەیشی هەر دەکەوێتە ژێر دەستییەوە.

٦ ) مەیدانی ترسناک: کاتێک سوپا زۆر ڕۆیشتبێتە ناو قووڵایی خاکی دوژمنەوە و شار و شارۆچکەی زۆریشی بەدەستگیرنەکراوی جێهێشتبێت، خۆی خستووەتە مەیدانی ترسناکەوە گەڕانەوەی ئەستەمە.

٧ ) مەیدانی سەخت: کاتێک سوپا لە کێو و شاخ و دارستان و زۆنگاو و زەلکاو و هەر شوێنێکەوە دەڕوات کە تێپەڕین لێی سەختە کەوتووە مەیدانی سەختەوە.

٨ ) مەیدانی بازنەیی: جۆرێک مەیدانە کە ڕێگای هاتنە دەرەوە لێی تەسک و پێچاوپێچە و ژمارەیەکی کەمی هێزی دوژمن ئەتوانن هێرش بکەنە سەر هێزێکی زۆرتر و لەناویان بدەن.

٩ ) مەیدانی مەرگ: لەم جۆرە مەیدانەدا سوپا بەس بە مەرجێک ئەتوانێت زیندوو بمێنێتەوە کە ئازایانە و هیوابڕاو نەبەرد بکات.

* لە مەیدانی بەربڵاودا نەبەرد بکەن و لە ناوچە سنورییەکاندا ڕامەوەستن.

* هێرش مەکەنە سەر دوژمنێک مەیدانی ستراتیجی دەستگیر کردووە و لە مەیدانی پەیوەندی گەیێنیشدا مەهێڵن ئارایشت و پێکهاتەی سوپاکەتان تێک بچێت.

* لە مەیدانی چەقدا، لەگەڵ شاخەکانی ئەو ویلایەتەی هێرشتان کردۆتە سەری، هاوپەیمانێتی بکەن و لە مەیدانی ترسناکیشدا هەر چی ئەتوانن تاڵان بکەن.

* لە مەیدانی سەختدا مەوەستن و بەردەوام بن لە ڕۆیشتن. لە مەیدانی بازنەییدا بەس بیر لە فێڵەکانی دوژمن بکەنەوە و لە مەیدانی مەرگیشدا بەس یەک کار بکەن: جەنگ!

* جەنگاوەری لێزان لە مەیدانی سنووریدا ئەبێت وەکو مارێکی خێرا بێت کاتێک لە سەری دەدەن بە کلکی هێرش بکات، کاتێکیش لە کلکی دەدەن بە سەری هێرش بەرێت کاتێکیش پشتی ئەکەوێتە بەر لێدان بە سەر و کلکی هێرش بکات.

* لە مەیدانی سنووریدا، هێزەکان ئەبێت بە تەواوەتی پێکەوە هاوکار بن تاکو بتوانن وەکو مار هێرش بکەنە دوژمن.

خێرایی، مایە و جەوهەری جەنگە!

Speed is the essence of war!

* لە نائاسایی دوژمنەکەت وەرگرە، لە ڕێگا چاوەڕوان نەکراوەکانەوە تێپەڕە و لە ناوچەیەکەوە هێرشی بۆ بکە دیدەوانی نیە.

*کاتێک لە مەیدانی ترسناکدای، هێزەکانت نزیکی یەکتری ڕاگرە، بەمکارە دوژمن ناتوانێت لێت بدات.

* بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی سوپاکەت، زەوییە بە پیتەکان تاڵان بکە.

* سۆن تزوو دەڵێت گرنگییەکی زۆر بدەرە خواردنی سوپاییەکانت و بێ هۆ ماندوویان مەکە و پێش ئەوەی جموجوڵیان پێبکەی پلانی قووڵیان بۆ دابڕێژە.

* سۆن تزوو دەڵێت: لە مەیدانەکانی مەرگدا، بۆ جەنگاوەرەکان ڕوونی بکەنەوە کە هیچ ڕێگەیەکیان بۆ زیندوومانەوە نیە جگە لە جەنگ. ئەمە لە ناخی هەر سەرباز و جەنگاوەرێکدا کاتێک ئەکەوێتە گەمارۆوە، بەگڕی و بەرخودان ئەکات کاتێکیش مەرگ لە بەرامبەری خۆیدا ببینێت، تادوا هەناسە جەنگ ئەکات.

* سۆن تزوو دەڵێت: لە مەیدانی بازنەییدا، دوژمن ڕێگایەکی بچوک بۆ هەڵهاتن ئەکاتەوە و وا ئەکات لە ئەفسەر و سەربازەکان بیر لە هەڵهاتن بکەنەوە، منیش هێزەکەم نزیکی ئەو ڕێگایە ئەکەمەوە و ئینجا کە دوژمن هێرشی هێنا، ئەوان خۆیان لە بەرامبەری مەرگدا دەبینن و بیر لە ئەوە ئەکەنەوە تادوا هەناسە جەنگ بکەن.

* سۆن تزوو دەڵێت: هەر لە کۆنەوە، ئەو کەسانەی وەکو لێزانی بواری جەنگ ناسراون چەند کارێکیان کردووە، ئەوان نەهێڵن پاش و پێشی سوپای دوژمن یەکبگرن، نەهێڵن بەشی بچوک و گەورەی سوپای دوژمن یارمەتیدەری یەکتر بن، نەهێڵن هێزە باشەکانی دوژمن فریای هێزە شکستهێناوەکان بکەون، نەهێڵن فەرمانەکان و کەسانی ژێرفەرمانیان پشتیوانی یەکتر بن.

* سۆن تزوو دەڵێت: ئەفسەرەکانی من حەزی زۆریان لە دارایی و سامانی زۆر نیە، نەک لە بەر ئەوەی حەزیان لە خۆشییەکانی ئەم دونیایە نیە، بەڵکو لە بەر ئەوەی چاوەڕێی تەمەن درێژی ناکەن، ئەگەر چی قینیانیش نیە لە تەمەن درێژی.

کاتێک جەنگاوەرەکان بخەینە بارودۆخێکەوە ڕێگەی هەڵهاتنیان نەبێت،

ئازایەتییەکی بێ وێنە و نەمر لە خۆیان پیشان ئەدەن.

When throw them into a situation where there is no escape,

they will display immortal courage.

هەر فەرماندەیەک ئەبێت

هێمن، نادیار و ئاڵۆز، بێلایەن و خۆدار بێت.

It is the business of a general to be

serene and inscrutable, impartial and self-controlled.

* ئەگەر فەرماندە هێمن بێت تووڕە نابێت، ئەگەر نادیار و ئاڵۆز بێت کارەکانی پێش بینی نەکراو دەبێت، ئەگەر بێلایەن بێت نەگونجاو و نالەبار نابێت، ئەگەریش خۆدار بێت سەرلێشێواو نابێت.

* سۆن تزوو دەڵێت: فەرماندە نابێت ئەفسەر و کەسانی ژێردەستی لە پلانەکانی ئاگادار بکاتەوە.

خۆتان لەگومان و دوودڵی ڕزگار بکەن.

Rid doubt and uncertainty.

* فەرماندەی کارزان و لێزان، هەر جار شێواز و پلانەکانی ئەگۆڕێت بۆ ئەوەی کەس شێوە و خووی جەنگییەکەی نەناسێت.

* یەکێک لە کارەکانی هەر فەرماندەیەکی گەورە پێکهێنانی سوپا و دامەزرانی لە جێگە و بارودۆخێکدایە کە سوپا ناچار بێت جەنگ بکات.

* هێزەکانتان دژی دوژمن چڕبکەنەوە، ئاوەها دەتوانن لە مەودای هەزار کیلۆمەترییەوە فەرماندەی دوژمن بکوژن. بۆ بەدەستهێنانی ئامانجێکی وا پێویستە بە توانای هونەری و زیرەکییەوە کاربکەن.

* هەرکە سیاسەتی هێرشتان گرتە بەر، ڕێگای هاتووچۆ دابخەن، پاسەپۆرتەکان پووچەڵبکەنەوە و دانوستان لەگەڵ نوێنەرەکانی دوژمن ڕاوەستێنن.

* هەرکە لە لایەن دوژمنەوە هەلێکت بۆ ڕەخسا، خێرا کەلکی لێ وەرگرە بە مەرجێک بزانیت فێڵ یا خود تەڵەک نییە.

* یەکێک لە بنەماکانی جەنگ ئەوەیە بەردەوام بەدوادا چوونی بکەی بۆ شوێنی دوژمن و لە شوێنێکی گونجاو و پێویستدا جەنگ دەست پێبکەی.

* لە سەرەتاوە وەک کچێکی شەرمن بە هێواشی و نەرم و نیانی بجوڵێ، هەرکە دوژمن هاتە شوێنێکی گونجاو دەرگایەکی بۆتکردەوە، وەک کەروێشکێکی کێوی خێرا بە و هێرشی بۆبکە، ئەوسا ئەبینیت توانای بەرگاری تۆی نییە.

* پێنج شێوازی هێرشکردن بە ئاگر هەیە: یەکەم، سووتاندنی کەسەکانە. دووەم، سووتاندنی کۆگاکانە. سێیەم، سووتاندنی تفاق وکەل و پەلە. چوارەم، سووتاندنی جبەخانەیە. پێنجەمیش، بەکارهێنانی مووشەکی سووتێنەرکە ئەتوانێت زۆرشت ئاگر بدات.

* بۆ هێرشکردن بە ئاگر خۆفرۆش و خاینەکانی دوژمن یاخود سیخوڕەکانی خۆتان بەکاربێنن. لەم جۆرە هێرشەدا ئەبێ ئاگاتان لە کەش وهەوایش بێت.

*کەرەستەی ئاگرپێوەنان لە پێشدا دابین بکەن لەبەردەستدا دایبنێن.

* بۆ هێرشکردن بە ئاگر ئەبێت بەردەوام ئاگاتان لە گۆڕینی شوێن بێت و بەگوێرەی پێویست بجولێن.

*کاتێک ئاگر لە ئۆردوگا یاخود سەربازگەی دوژمندا بڵاو بوویەوە، ئەبێت چالاکی سەربازیتان هەبێت تاکو بتوانن هێرشەکەتان بگەیەننە ئەنجام.

* ئەگەر پاش ئەوەی ئاگر لە ئۆردوگا یاخود سەربازگەی دوژمندا بڵاو بوویەوە، هێشتا جەنگاوەرەکانی دوژمن ئارام و هێمن بوون، هێرش مەکەن و چاوەڕێی دەرفەتێکی گونجاو بن.

*کاتێک ئاگرەکە گەیشتە لووتکەی خۆی، بە پێچەوانەی ئاراستەی با مەجولێن، ئەگەر واجەن خۆتانیش ئەکەونە ناو ئاگرەکەوە.

* پیاوانی سیاسەت ودەسەڵاتدارەکان بیر لە پلانی جەنگی ئەکەنەوەو فەرمانەکانیش جێ بە جێی ئەکەن.

* ئەگەر کارێک لە بەرژەوەندی وڵاتەکەت نیە، مەیکە. ئەگەر ناتوانی سەرکەویت، جەنگاوەرەکان بەکارمەهێنە.

ئەگەر ژیانت لە مەترسیدا نیە، شەڕ مەکە.

If you are not in danger, do not fight.

دەسەڵاتدارێک کە تووڕە بێت، ناتوانێت سوپا پێکبێنێت.

فەرماندەیەکیش کە ڕەنجاو بێت، ناتوانێت بجەنگێت.

A sovereign cannot raise an army because he is enraged,

nor can a general fight because he is resentful.

پاش ماوەیەک، دەسەڵاتدارێکی تووڕە یاخود فەرماندەیەکی ڕەنجاو لەوانەیە شاد ببنەوە،

بەڵام ویلایەتێکی لەناوچوو ناگەڕێتەوە و مردووەکانیش زیندوو نابنەوە.

For while an angered man may again be happy, and a resentful man again be pleased, a state that has perished cannot be restored, nor can the dead be brought back to life.

*کەواتە، دەسەڵاتدارێکی ژیر و فەرماندەیەکی لێهاتوو لە تووڕەیی و ڕەفتاری ناداواو و لەزالەزدوور ئەگرن و بەم کارانە وڵاتەکەیان لە ئاسایش و سوپاکەیان لە ئامادەباشیدا ڕائەگرن.

* بە ئەزموون دەرکەوتووە بۆ دابینکردنی تفاقی نەبەردێک و پێکهێنانی سوپایەکی بەهێز، ڕۆژانە پارەیەکی زۆر دەبێت خەرج بکرێت کە هیچ حکومەتێک لە ماوەیەکی درێژخایەندا ناتوانێت ئەو هەموو پارەیە بدات و خەڵکیش وردە وردە لە بارودۆخەکە دەڕەنجێن و ماندوو دەبن.

* سۆن تزوو دەڵێت: ئەمە زۆر بێ عەقڵییە فەرماندەیەک ساڵهای ساڵ بەرەنگاری دوژمن بکات و هەر ڕۆژ هەوڵی سەرکەوتن بدات بەڵام سیخوڕەکان بەکارنەهێنێت و چەند سەد سکەی زێڕ و ناو و نیشانی فەخر و دەستخۆشی لە سیخوڕەکان بەلایەوە گران بێت کەسێکی ئاوەها نە فەرماندەیەکی ڕاستەقینەیە، نە پشتیوانی ڕابەرە و نە فێرمەند و مامۆستای بەدەستهێنانی سەرکەوتن.

* سۆن تزوو دەڵێت: هۆکاری ئەوەی دەسەڵاتدارێکی ژیر و فەرماندەیەکی لێزان ئەتوانن هەرکات ئیرادە بکەن دوژمن شکست بدەن شتێکە ئەوان هەیانە و خەڵکی ئاسایی نیانە، ئەو شتەیش زانیاری لە غەیبە! مەبەستی من لە زانیاری لە غەیب، نە ڕۆحە، نە یارمەتی خودایە، نە باسی مێژووە و نە باسی هەڵسەنگاندن. ئەو زانیارییانە ئەبێت لە کەسانێک شوێنی دوژمن دەزانن وەربگیرێت.

* پێنج جۆر سیخوڕ هەیە کە بریتین لە:

١- سیخوڕی خۆماڵی

٢- سیخوڕی ناوەوە

٣- سیخوڕی دوولایەنە

٤- سیخوڕی هەڵکراو

٥- سیخوڕی چالاک

کاتێک هەمووی ئەمانە پێکەوە بۆ حکومەت کار بکەن، پێیان دەڵێن "دەستەی پیرۆز" و بە ڕاستی گەنجینەی حکومەتن.

* سیخوڕی خۆماڵی، هاووڵاتی وڵاتی دوژمنن و ئێمە بەکاریان دێنین.

* سیخوڕی ناوەوە، بەرپرسانی فەرمی دوژمنن و ئێمە بەکاریانمان هێناون.

* سیخوڕی دوولایەنە، سیخوڕەکانی دوژمنن کە ئێمە زانیومانە پێیان و بەکاریان دێنین.

* سیخوڕی هەڵگەڕاو، ئەو سیخوڕانەی خۆمانن بەئەنقەست زانیاری هەڵەیان پێ ئەدەین. ئەم سیخوڕانە یان خایینن یاخود تاوانبارن و لەکاتی چالاکی لە وڵاتی دوژمندا دەست بەسەرکرێن و دوژمن زانیارییان لێ وەرگرێت و بە پێی ئەو زانیارییانە کار دەکات، ئێمەیش لەم ڕێگایەوە بەئەنقەست وامان کردووە زانیاری هەڵە بکەوێتە دەستی دوژمن.

* سیخوڕی چالاک کەسانێکی زیرەک، لێزان، ژیر و نزیک لە دوژمنن و زانیاری باش وەکو نجاو لە دوژمن دێنن بۆمان. ئەم کەسانە زۆر بە باشی چالاکی و جموجوڵی دوژمن ئەخەنە ژێر چاودێرییەوە. ئەم کەسانە هەندێک تایبەتمەندییان هەیە بریتین لە: زۆر زیرەکن بەڵام خۆیان گەمژە پیشان ئەدەن، بە ڕەواڵەت نەرم و نیانن بەڵام لە ناخەوە زۆر بەهێز و ئازان. زۆریش خێرا، توانا و خۆڕاگرن.

* سیخوڕەکان لە هەموو کەس نزیکترن لە فەرماندە گەورەترین پاداشتەکانی جەنگیش بە ئەوان دەدرێت چونکو هیچ شتێک ئەوەندەی ئۆپەراسیۆنێکی شاراوە ناتوانێت دڵخۆشی بداتە سوپا.

*کەسێک ژیر و بێلایەن و ڕاست و دروست نەبێت، ناتوانێت سیخوڕەکان بە باشی بەکاربهێنێت کەسێکیش زۆر وریا و چاوپێک و دەس ڕۆیشتوو نەبێت ناتوانێت زانیارییەکانیان لێ وەرگرێت و لێیان تێبگات.

* ئەو سیخوڕانەی بەس مەبەستیان پارەیە، بە قسەی هیچ و پووچ فەرماندە سەرقاڵ ئەکەن بۆ ئەوەی داهاتەکەیان زۆرتر بێت.

* ئەگەر پلانێکی جەنگی پشت بەستراو بە ئۆپەراسیۆنێکی سیخوڕی، ئاشکرا بوو، باشترە سیخوڕ و هەموو ئەو کەسانەی لەگەڵی قسەیان کردووە لەسێدارە بدرێن.

*کاتێک پلانی هێرشکردن بۆ سوپای دوژمن یاخود شارێکتان هەیە یاخود ئەتانەوێت کەسێک تیرۆر بکەن، ئەبێت لە پێشدا زانیاری تەواو و وردتان لە سەر ناوی فەرماندەی سەربازگە، ئەفسەرەکان، پاسەوانەکان و پارێزەرەکان هەبێت. ئەم زانیارییانە لەگەڵ هەموو وردەکارییەکانیانەوە لە سیخوڕەکانتان وەربگرن.

* ئەمە کارێکی زۆر گرنگە: بە شوێنی سیخوڕەکانی دوژمندا بگەڕێن و بەرتیلیان بدەنێ و قەناعەتیان پێ بکەن کارتان بۆ بکەن و ببنە سیخوڕی دووڵایەنە.

* سیخوڕەکانی خۆماڵی، ناوەوە و دووڵایەنە باشتر ئەتوانن یارمەتیت بدەن و هەوڵ بدەن پارەی باش بدەنە بە تایبەت سیخوڕە دووڵایەنەکان.

*کەواتە، بەس ڕابەرە زیرەک و فەرماندە لێهاتووەکان ئەتوانن کەسانێکی زیرەک وەکو سیخوڕ بەکاربهێنن تا سەرکەوتنە گەورەکان تۆمارکەن.

* ئۆپەراسیۆنی شاراوە و سیخوڕی لە پێویستییەکانی جەنگن کە سوپا ئەتوانێت بە پشتیوانییان هەموو پلانەکانی خۆی دابڕێژێت و جموجوڵەکانی بە پێی ئەو زانیارییانە بێت.

سوپای بێ سیخوڕ، ڕێک وەکو کەسێکی کەڕ یا خود کوێرە!

An army without secret agents

is exactly like a man without eyes or ears!